بسم الله الرحمن الرحيم

## لەم ژمارەیەدا

| بابەت | نووسەر | لاپەرە |
|---|---|---|

خوێنه‌رانی به‌ڕێز !

له‌گه‌ڵ چه‌پکه‌ نێرگسی به‌هاری داو، به‌ شنه‌ی وه‌شتی مانگی ئازاری ڕاپه‌ڕین و بووژانه‌وه‌دا، چه‌پکه‌ سه‌لامی بۆنخۆش و گه‌رم ئاراسته‌ی به‌ڕێزتان ده‌که‌ین و، هیواداریین تۆوی پڕ مایه‌ی ده‌شتی دڵه‌ کێڵراوه‌کانی به‌ئیمان، وه‌کو گوڵاڵه‌ سووره‌کانی به‌هارو خه‌ڵه‌ی سه‌وزی شاره‌زوور گه‌ش و پاراو ببنه‌وه‌ .

له‌گه‌ڵ داوای لێبووردن له‌ دواکه‌وتنی ئه‌م ژماره‌یه‌دا، ئاواته‌خوازین ڕۆژه‌ درێژه‌کانی به‌هاری ئه‌مساڵمان پڕ خێر بن و، له‌ خزمه‌تی خۆمان و گه‌ل و ولاّتماندا بیانبه‌ینه‌ سه‌ر .

دووباره‌ سه‌لام و ڕێزمان هه‌یه‌ و، سه‌رکه‌وتووبن .

******************************

گۆڤارێکی ڕۆشنبیری مانگانه‌ی گشتییه‌

ناونیشان : پۆسته‌ی سلێمانی ص . پ ١٠٦

١

# ڕووداوه کانی ئازار و..

## چه ند سه رنجێک؟

مانگی مه رگه ساتی هه ڵه بجه یه و، ڕۆژانی ( ئازار) ی ڕاپه رین و به گـــژا چوونی دێوه زمه ی سته مکاری و، ره واندنه وه ی ته می ترس و، شکاندنـــــــــی تــه لیســـمی دیـکتاتـــۆریــه ت ..

جێی خۆیه تی که له یادکردنه وه ی هه ر بۆنه و موناسه به یه کدا ، دووبــــاره کردنه وه ی ڕۆتین و گێڕانه وه ی ڕووداوه کان نه که ینه پیشه .. ڕووداوانــێک که ڕۆڵه کانی جه ماوه ر خۆیان تیایاندا به شداربوون و، هه ر ئه وان پاڵــه وانـــــی یه که مینی و ، به مایه ی ئاره ق و فرمێسک و خوێن نه خشاندوویانن و تالاویان چه شـــتووه .

که واته دووپاتکردنه وه ی دوور له ده رس وه رگرتن و، دوورله په ندو عیبره ت هه ڵگۆزین له تاک تاکـــی ڕووداوه کان و قۆناغه کانیان ، جگــه له وزه خه رجکردن و کات کوشتنـــی خه ڵکی و ، مراندنی ڕووی له بـــارو ئیجابیی ڕووداوه کان هیچی تر نیيه.

ئه مڕۆش پاش تێپه ڕبوونـــــی چوارساڵ به سه ر تراژیدیــــــای هه ڵه بجه داو، دووساڵ به ســــــه ر ڕاپه رینی ئازار داو، چه شتنی تالاوی به سه رهاته کان و، ده ستکه وتـــنی یه که م ئه ڵقه ی به رهه مــه کانـــی ڕاپه رین ، خه ڵکی ڕه ش و ڕووتــــی کوردستان که سووته مه نیی کـــووره ی ڕووداوه کان بوون ، به ته مان ئێستـه

له فه زای ئازادی ده ره وه ی کوورەکه بحه وێنه وه و ئاره قی ماندووبـوون بـسڕن .

له ئاوا بارودۆخێکدا که خه ڵکی فرکه یان دێ به دوای نان و شـیری منداڵـداو، شه به ح و ترسی فه راغـی گیان و مێشک و سک خه ریکه سه ریان تێ ده کا ، جێی خۆیه تی که ئێمـه ی پێشه نگانی فکرو سیاسه ت وره وشت له جێی کولا ندنه وه ی زامی کۆنیـان به دانانی پرۆژه ونه خشه ی له بـار بۆ چاره ی کێشه کان ، برینـه کـان سارێژ بکه ین و ، گۆشه یـه کـی ئاواته زه رد هه ڵگه راوه کانـیان بـۆ ڕۆشن بکه ینه وه .

ئه مڕۆ زۆربه ی چینه کانـی جه ماوه رمان کێوی خه می ئابلۆقه ی ئابووری لار بووه ته وه به سه ریانداو، هه ر تـاوه تا شه به ردێکی تـرس و خه م به سه ریانـدا تل ده کاته وه . بۆ به زگریی ئه م ترسـانه ش وێـرا ی بیرخستنه کارو دۆزیـنـه وه ی چاره سه ری گونجاو، هۆشیارکردنه وه و دلـدانه وه ی ده وێ ، وره بـه رز کـردنه وه و زیندووکردنه وه ی گیانـی ( قه ناعه ت ) و ( توکل ) لـه سه ر خوای گه وره ی ده وێ ، هانـدانـی هێنانه وه کایه ی پیشه سازی یـه خۆماڵی و کاره ده ستـی و بـێ سه رمایه کانی ده وێ .

چینێکی تر - که لاوانی بڕبـڕه ی پشتمانن - له بۆشایی ده روونـی و ڕۆحیدا ژیانێکی ڕۆتینی و بێ مایه ی دووباره بووه وه ی بێ داهێنانکاری و دوور له گۆڕانکاری به سه ر ده بەن و، له جێی دروشمی ( انتاج ) و ( ابداع ) خه ریکه گێژه لووکه ی ( عـبثـیه ) بێ هوده ژیان لوولیان ده دا .

چاوگێڕانێکی به ئینصافانـه ی سه رجاده وبازاڕو قه یسـه ری و به ردووکانه کان شایه تێکی هه مـه ڕۆژه و زیندوون و، چـاو لێ نووقانـدنی سه رسمی گه وره مان تووش دێنێ و، لاوان و تازه لاوانـیش به ره و هه ڵدێرێک ده بات که هیوای گه شتنی ده ستمان پێیـان بـه ته واوی بنه بڕ ده کات .. ئـه گه ر لاوانیشمان بلێن : کوا پرۆگـرام و به رنامه ؟ کوا هێلی ڕوون و ده نگی خاوه ن ئایدۆلۆجی و بـیر و-

بۆچوونه کان ؟ کوان کۆره فکـــوری و - تایبه ته کان به بیرو بۆچوونـــه وه ؟ کوان ده رس و وانه ڕه وشـــــتـــی و ته هـذیبی یه کان ؟ .. کوان..؟ کوان؟ هه قیانه و .. هه موو به رپرسیــــاری وه لآمـــی ئه م پرسیارانه ین .

چینێکی تری کاریگـــــــــه رو جیٌده ست دیاری میلله تمان چینـــی هونه رمه ندو ئه دیب و نووســه رانو گشتی تر بلێین چینی ڕۆشنبیرانمانن که له ڕاستیدا له هه ر کات و شوێن و سه رده مێکٔ ئێسته زیاتر بواریـــان بۆ ڕه خساوه و ، هه ق وایـــــه زۆر مه وزوعی یانه قه لّه م و خـــــامـــه هه لّسووڕێنن و، له به رهه مه‌کانیاندا کالآی ( هاوچەرخێتی ) بکه ن بـــــه به ری ( ڕه سه نایه تی ) داو، ئـــه و دروشمه دیکته کراوو تایبه تکراوانـه به بارو دۆخ و جیٌ و ڕێی دوورلــــه ولآتمانه وه نـه که نه مه شـخه لّـــی ڕێیـان و ، له بیریان نـه چـــــێ که له‌کوێ قسه ده که ن و ده نووسن و، له چ سه رده م و دۆخێکدا ده نووسن..

به لّێ ، ئه م چینه ش خۆی لـــه خۆیـدا پێش ئه وه ی بۆ خـه لّـــکی بنووسیٌ و بنه خشێنیٌ ، ده بیٌ خـــۆی له حه قیقه ت و ( موضوعیت ) دا قالٌ بکات و، ڕه وڕه وه ی کارو به رهه می له سه ر ڕۆلّی واقیعیی ئه م گـــه ل و ولآتـــه بـخـاتـــه ڕیٌ .

به لآم ده بیٌ هه موو ئه م ڕاستی- - یه مان له بیر نه چیٌ که ئه مانــه هه موو به لای خۆیانه وه له به هـاری ڕاپه ڕینـدا ئاره قیان ڕشتووه‌وشتۆوی ئه رکٔ و واجباتیان وه شاندووه و ، ئێستـه ش له وه رزی هاوینـی(حاصلات) دا به ته مای دروێنه ی ماف و(حقوق) - ه کانـــن و، ئه وه نده چاو ده خه ن بـــۆ(وه لآم) گـویٌ شل ناکه ن بۆ(بەلآم).

لێره وه ده رده که ویٌ تـــه وه رەی کاری خاوه ن ئه رکه کان - چ پسپۆرانو ( مصلحان ) ، چ به رپرسیاران کامیه وه زنجیره ی چه شمه ندازه ئاواتی- - یه کان له کوێوه ده ست پـــــــیٌ ده کات و له کویٌ کۆتایی دێت .

له خوا ده خوازین بـــــه ســـه ر کۆسپه کاندا سه رمان بخات و، خـۆ- ڕاگریی به چینی زه حمه تکێشـــــا ن بدات و، خه فه ت و هه لّمـــــه ت و، هیممه تیش بەخه مخۆران ببه خشیٌ .

قورئان و ڕاستکردنه وه ی بۆچوونـه کان :

ـ ١ ـ

ماموّستا عمر عبد العزيز

خوێنه رانی به ڕێز !

له بارودۆخێکی وه کو ئه مڕۆدا ـ که بوار بۆ هه ڵسووڕاندنی قه ڵـه م ڕه خساوه ـ جێی خۆیه تی که بچینه وه به هه ندێ له بۆچـوونه کانماندا و، وێنـه ی ڕاست ودروستی بهشێک له کێشه ئایدۆلۆجی و کۆمه ڵایه تی یه کانماندا بخه ینه ڕوو.

له ڕاستیدا ئه و سه رده مـه به سه رچوو که به هه ق و ناهه ق بیرو بۆچوون بسه پێنرێ به سه ر خه ڵکیدا وه چاوه ڕوانی بێ لام و جیمیان لـێ بکرێ چونکه ئاستی ڕۆشنبیریی گشتی ـ به تایبه تی چینی پسپۆڕانـی کۆمه ڵناس و توێژه خوێندکاره کـان له پله یه کدایه که بێ به ڵگه ناچن به هانای هه ر پرۆژه یه کی فیکری یـا کۆمه ڵایه تی یه وه .. سـه ره ڕای ئه مه ش سه رده می شێوازی ملهوڕانه وه سه پاندنی دیکتاتۆرانـه ی ڕا و ـ بۆچوون به سه رچووه و، چه رخـی وتووێژو گفت و گۆی ڕاسـته وخـۆ هاتووه ته کایه وه .

ئه مرۆ ـ به ڕاشکاوی ده ڵێین ـ ڕۆژی قه ناعه ت پێ کردن و دڵنیایی به خشین و متمانه پێ دانه .. ئه مرۆ چی دی خه ڵکی به دێوجامه ی دروشمی زرق و برق دار ناخه ڵه تێن .. چونکه

له ئه زموونگه ی ڕووداوه کانی ڕابردوودا ئه وه نده تالاوو ژاراو به ناوی شه ربه ت و ئاوی حه یاته وه دراوه به خه لکی ، که به ترسه وه ده م بۆ ئاوی زولال ده به ن و،وهک ماراگاز له جوولّه ی گوریس و خشه ی پێی مێرووش ده ترسن .

بێگومان ئه م دیارده یه ده بێ ببێته خالێکی زه قی وه رچه رخاندن له شێوازو ڕێبازی هه موو لایه نه فیکری و سیاسی یه کاندا و، به ئه ندازه ی ئه و گۆڕانکاری یه له هه لوێستی خه لکیدا دهبێ هه لوێست و شێوه کاری ئه وانیش له گه یاندنی بیرو بۆچوونه کانیاندا بگۆڕرێن .

وه ده بێ له جێی ڕازاندنه وه ی دروشم و پلانی تیۆری سه رکاغه زی ، پرۆژه ی عه مه لی و گونجاوو زیندوو پێشکه ش بکه ن و، ڕێگه ی تێگه یاندن و خزمه تکردنی تویژه کانی جه ماوه ر کورت و نزیک بکه نه وه .

جا ئه م هه لوێسته به هه ر راده یه ک ئه گه ر شیاوی هه ر لایه ن و خاوه ن بۆچوونێک بێت ، به راده یه کی زیاترو شیاوتر کاری باوه ڕدارانی شوێنکه وته ی په یامی ڕاستی یه ، ئه ویش له به رئه م چه ند ئیعتیباره ی خواره وه :

١ - باوه ڕداران به ش به حالی خۆیان حه زیان له هه لبڕینی دروشمی دوور له واقیع نی یه و،هه ر پرۆژه یه ک که عه مه لی نه بێت نایخه نه ڕوو و، کات و مێشکی خه لکی پێوه مه شغول ناکه ن .

سه رمه شقیشیان له م بواره دا فه رمووده ی خوایه که له سوره ی(صف) دا ده فه رموێ :(( ياأيها الذينَ آمَنوا لِمَ تَقولونَ ما لا تَفعلون . كَبُرَ مقتاً عند اللّهِ أن تَقولوا ما لا تَفعلون )) .

٢ - له سه رێکی تره وه باوه ڕداران به ته مای پاداشتی خوای گه وره ن و، هه روه ک له لۆمه ی لۆمه کار نا سله مێنه وه ، چاوه ڕوانی سوپاسگوزاریی خه لکیش نین ، چونکه خزمه تکردن و ( إصلاح) و چاره ی گیروگرفته کان به ئه رک و واجبی سه رشانیان ده زانن ، نه ک به

پیاوه تی کردن و ده روازه ی مـــنه ت نان به سه رخه لکیدا .

۳ ـ جگه له وانه ش شێوازی وتوویژو ( حوار ) له گه ڵ هه موو لایه نێکـــدا شێوازێکه که له قورئاندا نموونـــه ی زیندووی هاتووه و ته ئکیـــــــــدی له سه ر کراوه .

جا ، ئه گه ر به وردی لێکوڵینه وه ـ یه کی قورئانی بکه ین ده بینین که چ سه رمه شقێکی بۆ شوێنکه وتووانـــی له و بواره دا نه خشاندووه ، ئه مه ش له چه ند قۆناغی جیاجیاداو، بـــــه چه ند هه ڵوێستی دیـــاری کراو .

**یه کەم :**

**ده سته به ندیی قورئان بۆ کۆمه ڵگا :**

قورئانی پیرۆز ـ که له هـه مـــوو روویه که وه به رنامه ی ژیـــــــان و سه رچاوه یه بۆ ئێمه ـ بـــــــــاری دیموگرافی ( سکّانی ) سه رده مـــی ( نبوّت ) ی روون کردۆتــــــــه وه و، ده سته به ندی یه کی وردی کۆمه ڵگاکه ی کردووه ، دیاره که هه مان رێباز بۆهه ر سه رده مێک دووباره ده بێته وه،لەگەڵ چه ندگۆڕانکاری یه کی تایبه ت بـــه و سه رده مه وه ..

به پێی ئه و دیاری کردنه ی قورئان و نموونه ی زیندووی ژیانا مـــــــه ی پێغه مبه ر ( دروودی خوای لـێ بـێ ) کۆمه ڵگه ی سه رده می هاتنـــــــــه خواره وه ی قورئان له م چین وتاقمه جۆراو جۆرانه پێک هاتـــبوو :

(۱) **موسڵمانان :** که ئه وانیش قورئان خۆیان به ش به شیان ده کات :

کۆچ کردووان ، یاریـــــــــــده ران ، موسڵمانانی پێش فه تحی مه ککـه ، موسڵمانانی پاش ئه وه ، کـــــۆچ ـ نه کردووانی مه ککه .. دوای ئــــه وه هه موو ئه و به شانه ش له پلــــــه ی ئیمانداری دا سه روخواریان هه یــه .

بۆ نموونه سه یری ئایه تـــی (۱۰۲) و (۱۰٦) ی سوره تی ( ته وبه) بکه .

(۲) **موشریکه کان** له مه ککه ، کـــــه ئه وانیش راده ی دوژمنایه تی یـــان فه رقی هه بـــوو .

(۳) **دووڕووه کان :** که ئه وانیــــــش چه ندین توێژیان لێ ده بووه وه .

بۆ نموونه له ئایه تی (٤٥) و (٤٩) و (٥٨) و (٧٥) و(٨١) و(١٠٧) ی ســــوره ی

( توبه ) دا باس له(٦)تویژیان کراوه ، جگه له وه که له چه ند شوێنی تری قورئاندا باسیان لێوه هاتووه .

( ٤ ) **جووله که و فه له کان له مه دینه و ده وروبه ریدا .**

* جا قورئان سه ره تا ڕاستی یه کێ ده سه لمێنێ که گاوره کان هه لوێستیان نه رم تره به رانبه ر موسلمانان تا جووله که .

ده فه رموێ :(( لَتجدَنّ أشدّ النّاس عداوةَ للّذينَ آمنوا اليَهود و الذينَ أشركوا ولَتجدنّ أقربهم مودّة للّذينَ آمنوا الذين قالوا إنّا نصارىٰ )).

ئایه تی (٨٢) سوره تی ( مائده) .

* پاشان ئه وه ش دووپات ده کاته وه که هه موو یه کسان نین و، له چاکه و خراپه کردندا چه ندین جۆریان هه یه . وه به ئاشکرا ده فه رموێ :(( لَيسوا سواءً ، مِن أهل الكتابِ أمةٌ قائمةٌ يَتلون آيات اللّه آناءَ اللّيلِ وَهُم يَسجدون ))

١١٢ / آل عمران .

* هه روه ها باس له وه ده کات که هه یانه زانیاریی زۆره و، به هۆی زانیاری یه که یانه وه بڕواشیان باشه ده فه رموێ :(( لكن الراسخون في العلم منهم المؤمنون ، يؤمنون بما أنزل اليكَ)) / ١٦٢ ، النساء .

* هه روه ها باسی ده ستپاکیی هه ندێکیان ده کات، له به رانبه ر ناپاکیی هه ندێکی تریانه وه و ، ده فه رموێ :(( و من أهلِ الكتاب مَن إن تأمنهُ بقنطارٍ يؤدِّهِ اليكَ، ومنهم من إن تأمنهُ بدينارٍ لا يؤدِّهِ اليكَ))

٧٥/ آل عمران .

* وه له جێ یه کی تردا باس له وه ده کات که هه ندێکیان کاتێ گوێیان له قورئان بێت فرمێسکێ به چاویاندا دێته خواره وه ..

ده فه رموێ :(( و إذا سمعوا ما أُنزلَ الي الرّسول ترى أعينهم تَفيضُ مِنَ الدّمع مِمّا عرفوا من الحقّ)) .

٨٣ / مائده .

(٥) **ئه عراب : واته گونده و خێوه تنشینه کان :**

قورئانی پیرۆز ئه وانیش دمکاته چه ند به ش و، له ئایه تی(٩٨)و (٩٩) و (١٠١) و (١٠٢) و (١٠٦)ی سوره ی ( ته وبه) دا پێنج به شیان لێ باس

ده كات ، كه له باوه ڕداری ته ولوه وه تیایاندایه ، ( و من الأعراب مَن یُؤمن باللّه والیوم الآخر ) ٩٩/توبه .
تا زۆر كافرو ته واو دووڕوو ،
( الأعراب أشدّ كفراً و نفاقاً )
توبه/٩٢ ، وه ( مردوا علی النفاق)
١٠١ / توبه ، وه ئه وانه ش كه چاكه و خراپه یان تێكه ڵ كردووه ،
( و آخرون اعترفوا بذنوبهم خلطوا عملا صالحاً و آخرَ سیّئا عسی اللّه أن یَتوبَ علیهم ) ١٠٢/ توبه .

**دووه م :**

**لێكۆڵینه وه ی ده روونی و كۆمه لایه تی :**

قورئانی پیرۆز دوای ئه و ده سته بەندی یه د یموگرافی یه زۆر ورده ، لێكۆڵینه وه یه كی ده روونی ( سایكۆلۆجی) و كۆمه لایه تی ی هه موو ئه و چین و تاقمانه ش ده كات و تایبەتمه ندیو خه سڵه ته كانی ده ره وه وناوه وه -
- یان ڕوون ده كاته وه ، بۆ ئه وه ی به چاكی بناسرێن و، هه ر له سه ر بناغه ی ئه و ناسینه ش ( تعامل)یان له گه ڵ بكرێ و، هه لوێست

به رانبه ریان بنوێنرێ . بۆ نموونه سه یری ئایه تی ژماره (٤٥) و (٤٩)و (٥٨) و (٧٥) و (٦١) و(٩٠) و (٩٨ ) و (٩٩) و(١٠١) و (١٠٧) ی سوره تی ته وبه و،(٦٤ ) ی آل عمران و،(٥٢) ی مائده و، (١٥٠) ی ( النساء) بكه .

**سێیه م :**

**قۆناغه كانی ڕووبه ڕووبوون وشێوازی وتووێژ له گه ڵ ئه و چینانه دا :**

پاش ئه و ده سته به ندی و ناسانه ، قورئانی پیرۆز به گوێره ی بارودۆخی پڕ هه ورازو نشێوی ئه و سه رده مه ، بۆ هه ر جارێك و هه ر تاقمێك هه لوێستی گونجاوی جێ و كاته كه ی دیاری كردووه :

١- دیاره له سه ره تای بانگه وازدا هه لوێست له گه ڵ موشریكه كان گه یاندنیبانگه وازیخواو، ڕێ ڕوون كردنه وه یه و هیچی تر، ته نانه ت موسلمانان جگه له ئارام گرتن و دان به خۆداگرتن نابێت هیچ هه لوێستێكی تر بنوێنن ، له و سه رده مه دا بوو ئایه تانێكی وه ك ( قُم فأنذِر ) و ( فاصدع بما تُؤمَر) و ( أدعُ إلی سَبیلِ رَبّكَ بالحكمة

و الموعظة الحسنة ) و ( و اصبر على ما يقولون ) و، غه يرى ئه وانــــه نـێرراون .

به م جۆره له وسه رده مـــه دا به و شێوه یه ی که خوا ویستــــی، پێغه مبه ر (درودی خوای لێ بــێ) یارانی بانگی خه ڵکیان کردو،بیـر و بۆچوونی نویێ ئیسلامی یـــــان بێ سه پاندن و زۆره ملێگه یانـــد پێیان . . دیاره موسڵمانان له چینه ته واو چه وساوه کان بوون و هیـــچ جۆره ده سه ڵاتێکیان نه بوو کــــه داکۆکی له بانگه وازه که - بکره لـــه مافی شه خصیـی خۆشیان - بکه ن .

٢ - پاش ئه و سه رده مه کۆچکـردن هاته پێش و، به شێک له موسڵمانـان به ره و حه به شه که وتنــــه ڕێ و، له وێش به هه مان شێوه لـــه گه ڵ پادشای حه به شه دا که وتنه وتووێژو بۆچوونه لێک نزیکه کانی قورئـــان و ئینجیلیان خسته پێش چــــاوی. کارێک که له ڕاستیدا زۆر کاریگـه ر بوو ، وه بووه هوی لایه نگریــــــی ( نه جاشی ) له موسڵمانــــــان و پشتیوانی لێ کردنیان و، وه ده رنانی نـوێنه رانـــی قـوره یش .

ئه وه ش له ( حه به شه)، که جـــگـه هێزی ( وتووێژو لێدوان وشیکردنه‌وه) هیچ شێوازو چه کێکی تریـــــــان هه ڵ نـــه گرتـــبوو .

٣ - له قوناغێکی تردا، لایه نــگـرو پشتیوان بۆ بڕواداران لــه ده ره وه ی مه ککه - به تایبه تی له مه دینه - دا پـه یدا بوو، وه پێغه مبه ری خــــوا ( سڵاوی خوای له سه ر بێ ) زانـــــی که ده کرێ ( مه دینه) ببێتـــــــــه مه ڵبه ندی نوێ و، جێی حه وانــه وه و خۆ گورج کردنه وه بۆگه یانـدنـــــی په یامی خوا به گه لانی جیهان ، لـه دۆخێکی سه ربه ست و ئازاد دا . .

بۆیه فه رمانی کۆچ کردنــــــی دا و، خۆشی ته شریفیان برده مه ڵبه نــدی نـــوێ .

له و جێ یه دا ، سه ره تـــــــا په یماننامه ی له گه ڵ دانیشتوانـــی شارو ده ورو به ری به ست و هـه مـوو لایه نه کان مۆریـــان کرد، کارێک کـه سه رمه شقێکی مه شخه ڵداره بــــۆ بواری به یه ک گه یشتنـی خــاوه ن- بۆچوونه کان و، به ڵگه نامه یه کـــی

ئاشكرايە لە سەر ئەوەكە هەرگیز موسڵمانان بۆیان رە وا نەزانراوە كە بیرو رایان بە زۆر بسە پێنن .

- دوای ئەوەكە بنەما سەرەكی یەكانی دەوڵەتی ئیسلامی دامەزرا، خوای گەورە رێبازێكی گرنگی بۆ پێغەمبەر (سڵاوی خوای لێ بێ) دیاری كرد كە لە بواری گەیاندنی بانگەوازدا بیگرێتە بەرو لیێ لانەداو، پەنا نەباتە بەر هیچ شێوازێكی تر، ئەویش ئەمە بوو كە بۆیان روون كرایەوە كە ئاینداری بە زۆرە ملێ نابێ و ، فەرمان دراوە بە موسڵمانان كە كاری وا نەكەن هەرچەند خاوەن دەسەڵات بن .

خوا دەفەرموێ :(( لا اكراهَ في الدّين قد تَبيّن الرّشدُ من الغيّ)) . بەڵێ مادەم راستە رێی پەسەندی (رشد) روون بووە تەوە و، چەوتە رێی (غیّ) یش ئاشكرا بووە و، خەڵكی چاك و خراپی بۆ دەركەوتووە،چونكە دەزگای راگەیاندنی ئیسلامیی ئەو سەردەمە بە ئەركی پێویست لەو بوارەدا هەستاوە ، وە لە بەرئەوەی جێی بیرباوەر دڵ و مێشكەو، دڵ و مێشكیش بۆ كەس بە زۆرە ملێ رام نابێ و دەستی كەسی ناگاتێ، لە بەرئەمانە ناشێ و ناگونجێ زۆرداری و كوتەك كاری لە موسڵمان كردندا بە هیچ جۆر بخرێتە كار، لەم بارەیەوە خوای گەورە بە پرسیارێكی ئامێستە بە قەدەغە - كردن و سەرسورمان لە پێغەمبەر دەپرسێ :(( أ فأنت تكره النّاس حتّى يكونوا مؤمنين )) .. ئایا تۆ زۆر دەكەی لە خەڵكی تا ببنە برِوادار ؟!

بەڵێ، ئەو رێبازە بووە سەر- مەشق و مەشخەڵی رێی بروادران لە هەموو كاتەكانی ئەو سەردەمەداو بۆ هەمیشەش ئەو حاڵەت و سەردەمانە نوێ دەبنەوەو هەڵوێست و شێواز دەبێ هەر هەمان باسكراو بێت .

٥ - لە قۆناغێكی نوێ تردا، هەر- چەند كە دەوڵەتی ئیسلامی (كیان) و قەوارە و دەسەڵات و

هێزو نیرووی هه بوو، به‌لام
په یتا په یتا ئایه تی قورئان
ده هاتنه خواریّ و، تیایاندا فه رمان
ده درا به پێغه مبه ر (درووده‌ی خوای
له سه ربیّ) که له گه ڵ چینه کانی
(ئه هلی کیتاب) دا وتووێژ
بکات و ، هه وڵ بدات به شکو له
رییّ روونکردنه وه و قسه وباسه وه
بگه نه ئاکامێک .

٥٥ سه ره تا به م شێوه یه فه رمان
هات :(( قل یا اهل الکتاب تعالوا
الی کلمة سواء بیننا و بینکم الاّ
نعبد الا الله و لانشرک به شیئا
و لا یتّخذ بعضنا بعضا أربابا من
دون الله فان تولّوا فقولوا اشهدوا
بانّا مسلمون )) ـ آل عمران/٦٤
واته : ئه ی موحه ممه د! بڵێ به
ئه هلی کیتاب وه رن بۆلای وشه یه‌کی
یه کسانی نێوان ئێمه و ئێوه‌ئه ویش
ئه مه یه که جگه له خوا په رستشی
که سی تر نه که ین و هاوه ڵی بۆ
بریار نه ده ین و هه ندێکمان
هه ندێکی ترمان نه که ینه ئاغا و
سه په رشتیار ، جا ئه گه ر
پشتیان له م بانگه شه یه هه ڵکرد
پێیان بڵێ : ده ی به شایه ت بن
که ئێمه موسڵمانین .

٥٥ له سه رده مێکی تردا ، خوای گه وره
داوای له پێغه مبه ره که ی کرد که
هه ر ده عوا و بۆچوونێکیان ده رخست
ده رگای گفت وگۆ له گه ڵیان
بکه ره وه و، داوای به ڵگه یان
لیّ بکه . پێغه مبه ری خواش (سڵاوی
خوای لیّ بیّ) به وردی ئه م رێبازه‌ی
گرته به ر، بۆ نموونه با سه یرێکی
ئه م چه ند ئایه ته قورئانی یه بکه ین
که تیایاندا وته و هه ڵویستی
بیّ بڕواکان دیاری کراوه و، له
لا شه وه شێوه ی وه ڵام دانه وه ی
پێغه مبه ر (سڵاوی خوای لیّ بیّ)
روون کراوه ته وه :

ـ ( و قالوا لن تمسّنا النّار الا
ايّا معدودة ، قل اتّخذتم عند الله
عهدا فلن يخلف الله عهده ام
تقولون على الله ما لا تعلمون )
٨٠/ بقرة .

ـ ( و قالوا لن يدخل الجنّة الا من
كان هودا او نصاری ، قل هاتوا

برهانكم ان كنتم صادقين)
١١١/ بقره .
ـ (و قالوا كونوا هودا او نصارى تهتدوا، قل بل مله ابراهيم حنيفا و ما كان من المشركين) ١٣٥/بقره .
ـ (سيقول السفهاء من الناس ما ولاهم عن قبلتهم التي كانوا عليها، قل لله المشرق و المغرب)
١٤٣ / البقره .
ـ (و قالوا انا بكل كافرون، قل فاتوا بكتاب من عند الله هو اهدى منهما اتبعه ان كنتم صادقين) .
٩٣/ قصص .
ـ (فان حاجوك فقل اسلمت وجهي لله و من اتبعن) ـ ٢٠/آل عمران .
ـ (قال من يحيي العظام و هي رميم، قل يحييها الذي انشأها اول مرة) ـ ٧٩ / يس .

جا ، بە ڕاستی پاش چاو گێڕانێكمان بە موعجەمە قورئانی یەكاندا دەركەوت كە خوای گەورە زیاد لە (٣٣٢) جێدا فەرمان دەدات بە سەرپێغەمبەردا كە لەگەڵ هەموو چین و توێژەكانی دەوروبەریدا بكەوێتە گفتوگۆو شێوازی (حوار) و قسە و باس بگریتەبەر . وە چەندین جاری تر هەمان فەرمان بە سەر موسڵمانانیدا دراوە .

بەڵێ جێی سەرنجیشە كە ئەو ئایەتانە زۆربەیان لە شاری(مەدینە) دا هاتوونەتە خوارەوە.. لە سەر ـ دەمێكدا كە ئیسلام دەوڵەتی بووەو موسڵمانان دەسەلاتیان بووە، بەڵام چونكە باس لە موسڵمان كردن و بیرو بڕواگەیاندنە، بە وشێوە یەداوا لە بڕواداران كراوە كە لەگەڵ هەموو چینەنەیارەكاندا وتووێژ بكەن و مۆڵەتی ئەوانیش بدەن كە قسەو هەڵوێستیان ڕاگەیەنن و گوێیان لێ بگرن .. ئەگەر وانە بووە ، ئەی ئەو هەموو ئایەتانەی كە بە (قالوا..) دەست پێ دەكەن و بە (قل..)كۆتایی ـ یان دێت و، وشەكەش بۆ فەرمان پیادانەو پێویست دەگێرێت لە سەر پێغەمبەر كە جێ بە جێی بكا ،ئەمانە كەی ولە كوێ ولە چ دۆخێكدا هاتوونەتە خوارەوە ؟!

ئەمە لێكۆڵینەوەیەكی كورت و خێرای هەڵوێستی ئیسلام بوو لە

بۆ لاپەرە (١٨)

ماموستا مولود باوه مراد

لەو ڕوانگە یەوە کە مرۆڤ تەنها دروستکراوێکی سەربەخۆو ناوازەیەو، بۆ بەجێهێنانی ئەرکێ و کارێکی گەورە خولقێنراوە جیا لە هەموو ئەلقەکانی تری گیانەوەرانی سەر زەوی.. بەچاوی سەروەرو داهێنەرو، ئاوەدانکەرەوەی زەوی و، بنیاتنەری شارستانێتی سەیر دەکرێ .

پێکهاتنی دەرەوەو ناوەوەو، چەند لایەنەبوون و، بیروهۆش و، هونەرو زانست و، سۆزو ئارەزوو و، پەیوەندی یەکۆمەلایەتی یەکان و، هاوکاری کردن و، خوورەوشت و سلوکێ و ، خۆشەویستی و عیشق، وەدەیان و بگرە سەدان سیفەتی تر کە لە تایبەتمەندی یەکانی مرۆڤن شایەتی ڕاستیی ئەم بۆچوونەن .

جا ئەگەر لەم ئاستەگەورەتر و بەرزتر بڕوانینە مرۆڤ بەوەی کە : فویەکە لە ڕۆحی پەروەردگارومشتێکە لە خۆڵی زەوی ، ئەوا بێچەن و چون لە هەموو گیاندارانی تر جیاوازدەبێتەوەو، ناوازەیی لە دروست - بوونی دا دەگاتە پۆپەو ، ئا

لێره وه یه دەرگا لە سەر بێهووده بوون دادەخرێ و، ئەرکٔ و وەزیفەی مرۆڤ بە پێی قیەمی تایبەت بەمرۆڤ لە لایەن پەروەردگارەوە ڕەنگی بۆ دەڕێژرێ، تا بەو پێودانەش بەهای هەموو شتەکانی سەر زەوی دیاری بکرێت بە گوێرەی دوورو نزیکی و سوودو زیان و چاکٔو خراپی یان بۆ مرۆڤ.

دیارە کە زۆرێکٔ لە شتەکان لە خۆیاندا سوودو کەڵکێکی ئاشکرایان نی یە، بەڵام مرۆڤ بەهایان دەداتێ و سەنگٔو سلوکیان دەکات، ئیتر بەڵگە نەویستە کە خۆی لە لووتکەی هەرەمی بەهاکاندایە و، هیچ شتێکٔ لەو پیرۆزترو بە نرختر نی یە.

ئەمەش هاوکاتە لەگەڵ ڕەچاو- کردنی ڕادەی هاوسەنگی و لاسەنگیی ئەو دوو پێکهێنەرە سەرەکی یەی کە ئاوێتەی مرۆڤی لێ پێکٔهاتووە، واتە (گیان و لەش).

بەڵام کاتێکٔ ئەم بۆچوون و ڕوانگە خوایی یانە لێکٔ دەترازێن و، ئەو جۆرە تیۆری یانە دێنە کایەوە، کە مرۆڤ بە ئاژەڵێکی پەرەسەندووی زەمان دەدەنە قەڵەم و، زەمینە یان بۆ هاتنە دیی ئەو ئایدیۆلۆجی یانە خۆش کرد کە هەموو خواست وویستە- کانی مرۆڤی لە ئاستی خواردن و خواردنەوە و جێ حەوانەوە و جنس دا لێکٔ دایەوە، کە بە تێکڕای ئەم خاڵانەش پێدا ویستیی هەموو ئاژەڵێکی ترە و، ئەمەش یەکٔ لایەنە تێڕوانینی مرۆڤە لە ڕووی پێکهاتنی زیندە مادەی ئەندامەکانی لەش و ئۆرگانیزمی کارکردنیانەوە.. ئەوەی کە مرۆڤ و ئاژەڵ لە تەواوی خاڵەکانی ژیاندا یەکٔ بگرنەوە و، لە تەواوی هاو- کۆلکەکانیدا هاوبەش بن بوویە مایەی لە کیس دانی تەواوی ئەو قیەمە پیرۆزانەی کە مرۆڤیان وەکٔ تاجی بوون - وجود - دەدایە قەڵەم.

ئیتر بەمەش زەوی بووبە چەتری ئەم چوارچێوە یە و، مرۆڤیش بەم هەموو مەزنی یە یەوە خزێنرایە ناوی .. وە (بەرژەوەندی) لە بری (قیەم) بووبە پێوەری هەموو چاکە و خراپەکان و. لە پێناوی دا مرۆڤ و هەموو ئەو

به هایانه ی که پێوه ی به سترابـووون قـوربـانـی کران .

کاره ساتی هه ڵه بجه ش لـــه دوا برگه کانی سه ده ی بیستـه مدا نموونه ی نه مانی هه موو قیـه مو خووره وشتیـێکێ بـوو .

که خه ڵکێکی بێ تاوان و ژێـر-ده سته و بێ په ل و پۆ لـه خانـه و کاشانه ی خۆیـدا کرایه دمستخۆشانه‌ی ( به رژه وه ندی ) و ده زگاکانی مـافی مرۆڤ و، بنکه کانی ده سه لاتـی سوورو ره ش و حکومه تـه کانـی رۆژهه لات و رۆژئاوای لـه بـه ر ( به رژه وه ندی ) لێ کرِوکپ بوو.

رۆژی ١٦/٣/١٩٨٨ رۆژی خه زانی خه ڵكی شاری مه ینه ت بوو، لـه و رۆژه دا زیاتر له (٥٠٠٠) هه زارگه لا ی دره ختی سه ره تای به هار لـه زه رده په ری ئێواره دا خه زانی کرد، جارێکی تر نه مروودی زه مانـه مه نجه نیقی بۆ رۆڵه کانی ئیبراهیم سازکرد و ، خه ڵکیی بێده ره تـان بوون و خـواریان لێ گـیرا..

ئه مجاره یان دوژمنانی ئـه م شاره له گه ڵ هه وادا خۆیان گه یاندە سی و جگه رو دلی ئه و خه ڵكه ، تـا د ڵـنیابـن له ریشه کێشانـی .

له هه ر لا یه سه یر ده کـه‌ی هاواره ، زریانه ، نزایه قیژه یـه ، رولّه رۆ ، باوکه رۆ ، دواشایه تومانه، مـه رگ ده بـاری . .

ده ڵێـی مه حشه ره و، که چی ئێره ده شتی شاره زووره که ی نالی یـه ، ئاسمانی شار ده ڵێی کارگـه‌ی کیمیاوی یه و، که چی ئێره شاره کـه‌ی مـه ولـیه وی یـه .

ته رمی به کۆمه ڵ راست و چـه پ که وتوو، ده ڵێی به غـداکه ی هۆلا کۆیه که چی ئێره شاره که ی سالم وگۆرانه .

داسی مه رگی کیمیاباران خه ڵکیی بێ ره حمانه درووێنه کردبوو، بـه ده یان و سه دان خێزانی لێک ئـالاو له ده شت و ده رو ده روازه کانـی شاردا هه ریه که له بارو حاڵێکـدا دواهه نـاسه یان دابـوو ..

چه ندان بووک و زاوای ناکام بـه جلوبه رگی شایی یه‌وه گیانیان بووبووه دوو کۆتری سپی و ئـه یلا واندنه وه .

چه ندان ئافره تی سکپڕ له ئــــازارو ژانی لـه ڕێی ده رباز بوونـــــــدا به مردوویی به جێ مابوون ...
چه ندان منداڵی ساوامه مکی دایکـــی مردووی ده مژیٚ و، سه ر به سنگیــه وه ده نیٚ و سه رپۆشه که ی ڕاده کێشــیٚ و ده م ده نیٚ به لای ده میه وه تا بزانــیٚ بـۆچـــی یــاریی بــۆ نـاکات .
چه ندان نیوه گیان و کوێر بوو پــه ل ده کوتیٚ و هاوار ده کات ، بـــــه لاٚم فریادره س نـــی یـــه .
زۆربه ی ژێرزه مینه کانی ناوشـار بوونه ته مه نجه ڵی بوخارو، خه ڵکـی په نابه ر تیایـــدا پیشاوه..
شار یه کێ پارچه خامۆش کرا.. زۆری خانـووبه ره ی بوویه که لاوه ی بـه سـه ر یـــه کـــدا هاڕراو . .
نه ده نگی بانگێ و قامه ت .. نه زه نگی ده رس وقوتابخانه ، نه گرمه ی کڕین و فرۆشی بازاڕ، نه ده زگاو د یـــــوان، نه سفره و خـوان ، نه مێگه ل وشوان،
ئه وه ی مایه وه به **هه ڵپڕووزا وی** په نای برده به ر دوژمنی دوژمنه که ی و به م شێوه یه خه ڵکی شارماڵیان بوویه سه ر به شی ماڵان و ، خـۆشیـــــان بـــوونـه گاڵی بـن درکێ .
ئه و باوکه ی که ته مه نی چـــل په نجا ساڵی له سازاندنی خانـــه و لانه یه کـی ئارام دا بۆ خێزانه کـــه ی سه رف کردبوو، ئه وا له چوار چمکـی خێمه یه کـدا خاوه نی مشکی یـه که ی سه ریه تی و له په نای منداڵـــــه بیٚ دایـکه کانیدا کزۆڵه ی کردووه .
یان ئه و دایکه ی چۆکی ناوه بـــه سنگیه وه و ، نازانیٚ بو کام گـــــۆڕ غه ریب و، بۆ کام جوانه مـه رگـــــی بیٚ سه روشوێـــنـی بگـری .
خۆزگه ده مانتوانی دیمــه نـــی پێغه مبه ری خوامان ( دروودی خـوا ی له سه ربیٚ ) بێنینه به رچاو، که لـــه ڕاسه ری شنرویٚ وه چاوی له داستانـی قه تل و عامی پارچه یه کێ له ئوممه ته مه زلوومه که ی بوایه، تا بمانزانیایه داخۆ هه ڵوێستی چی ده بیٚ؟ چــــــی ده فه رمویٚ؟ ئێسته ش ئه وا پێنـج ساڵه به سه ر ئه م کاره ساته جـه رگێ ـ بڕه دا ده ڕوات و، ڕووداوه کان زۆرێکێ له ڕاستی یه کانیان گۆڕی .. به لاٚم ئه م

پرسیارە هەر زیندووە و هەر تازەیە و هەر نەگۆڕە و، مرۆڤایەتی وە شارستانێتی نوێ دەباتە ژێر پرسیار، بۆ ئەم شارە و ئەم خەڵکە وای لێکرا ؟ ئایا ڕوودانەوەی چەند جارێکی تر لە شوێنە جیا ـ جیاکانی تری جیهاندا چاوەڕوان ناکرێ؟

ئێمە دەڵێین : تا پێوەرەکان و قیەمەکان نەگۆڕێن لە بەرژەوەندی مرۆڤ و ، مرۆڤ لە ئاستی شایستەی خۆیدا سەیر نەکرێت ، لەمەش خراپتر چاوەڕوان دەکرێت .

پاشماوەی لاپەڕە (١٢) :

بواری وتووێژو(حوار ) داو، لە ئەڵقەیەکی تردا بتوانین تیشکێک بخەینە سەر ( **قۆناغەکانی بانگەوازکردن** ) و، تیایدا ئاماژە بە هۆکانی ئەو ڕووبەڕووبوونانە بکەین کە لە نێوان موسڵمانان و نەیارانیدا ڕوویان داوە .

مامۆستا عمر ڕێشاوی

**قازانج بەشەراکەت** بابەتێکی ئابووریی گرنگە ، بە زاراوەی زانیاریی فقە پێیی دەوترێ ( قراض ) یان ( مضاربە ) ، لە نێوان دوو لایەنی کاسبکاردا بەرپا دەبێ ، یەکەمیان پێیی دەگوترێ ( ربّ المال ) کە خاوەن ماڵەکەیە ، دووەمیان پێیی دەگوترێ ( عامل ) کە بازرگانی و ئیش و کار بە ماڵەکە وە دەکات .

فیقهی ئیسلام وەکێ هەموو بابەتەکانی تر مەرج و ڕچەی دروستبوون و دروستنەبوونی تایبەتی خۆی بۆ داناوە و دیاری کردووە . . وە بەم چەشنەی خوارەوە پێناسەی دەکات و ، دەڵێ :

**قازانج بەشەراکەت :** ئەوەیە کە خاوەن ماڵ هەندێ لە ماڵی خۆی جیادەکاتەوە و، دەیداتە دەست کارکەر ( عامل ) یێ تاکاری بازرگانیی پێ بکات و ، قازانجی ماڵەکە لە نێوانیاندا بێ ، بە جۆرێ کە هەردوو لایان لە سەری ڕێکێ کە وتوون وەکێ (٢:١ ، ٣:١ ، ٤:١ ، . . . ) ی قازانج .

**بەڵگەی دروست بوونی قازانج بەشەراکەت :**

قازانج بەشەراکەت مامەڵەیەکە لەو مامەڵانەی کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا هەبوون و، بەرنامەی ئیسلامیش بڕیاری دروستیی لە سەر داوە ، وە بەم شێوەیەی خوارەوە بەڵگەی دروست بوونی بۆ

ده هێنێته وه :

(١) (إجماع) : له هه مـــــــــوو چه رخه كانی ئیسلامـدا هـه مــــوو موسلْمانان رایان له سه ر دروســــت بوونی ئه م مامه لْه یه هه‌بووه‌وه یه .

(٢) (إقرار) ی پێغه مبه رمــــان محمد( دروودی خوای له سه ربـــێ)، له كاتی پیرۆزی خۆیدا و بـــــــه ئاگاداریی خۆی ئه م مامه لْه یـــــه كراوه و قه ده غه ی نه كردووه .

(٣) ئایه‌تی( لَيسَ عَلَيكُمْ جُنـــاحٌ أن تَبتغوا فَضلاً مِن ربّكم ) . .
به وشه ی (فضلاً مِن ربّكم ) دمیگرێته‌وه چونكه ئه میش ویستنــــــــــــــی زیاده و ده ستكه وتێكه له لایــــــه ن په روه ردگارمانه وه .

(٤) فه رمووده ی ( دعوا النـــــاس يرزق الله بعضهم من بعض ) .
ده توانرێ بكرێ به به لْگه لــــه سه ر دروست بوونی (١) .

ئه م مامه لْه یه لــه (٥) روكـــن پێكْ د ێــت :

١ ـ مالْ : ئه و پاره یه یه كـــــــه خاوه نه كه ی ده یداته ده ســـــتی ( عامل ) ه كـــه .

٢ ـ كار : ئه و ئالْ و گۆرو كریـــن و فرۆشتنه یه كه (عامل ) ه كه بـــــه پاره كه ی ده كات .

٣ ـ قازانج : ئه و زیاده یه یه كه لـــه ئه نجامی كرین و فرۆشتنێكْ كـــه ( عامل ) ه كه به مالْه كه ی ده كـــات پـــه یـدا ده بـــێ .

٤ ـ ( صیغه) : ئه و وتو وێژه یه كــه خاوه ن مالْه كه به ( عامل ) ه كـــه ده لْێ : ئه وا ئه م مالْه م دایتـــــێ تا بازرگانیی پێوه بكه یـــــت و ، قازانجه كه ی له نێوانی هه ردوكماندا بـێ و، ئه ویش قبوولْی ده كات .

٥ ـ دوولایه نه :(عامل،ربّ المال ) .

**مه رجه كانی دروست بوونی قازانـــج بـه شه راكه ت :**

(١) ئه و مالْه كه خاوه ن مالْ ده یداته ده ست ( عامل ) ه كه ده بێ پاره بێ، نه كْ شتومه كی تر.

(٢) خاوه ن مالْه كه رێ به (عامل)ه‌كه بدات به هه موو ئازادیی خـــۆی

(١) ( المجموع )/به رگی ١٤ ، لا په ره ( ٣٦٠ )

بازرگانیی بە ماڵەکەوە بکات لـــە هەموو شتێکدا ، یان ئەو شتانــــەی کە بە زۆری هەبن ، وەک : فــەرش ، قوماش ، دانە وێڵە ،.... هتد .

(٣) ڕێژەیەکی تایبەتی لـــــــــە قازانجەکە لە نێوان خۆیاندا دیــاری بکەن ، وەک : (٥٠٪) یان (٤٠٪) ،یان (٣٠٪) ، یـان هەرچەند بێ .

(٤) نابێ ماوەی بۆ دیاری بکـــرێ، چونکە گەلێ جار زەرەر دەکـــات و ماوە بۆ ( عامل ) ەکە نامێنێ تـــا بە ئاڵ و وێڵێکی تر زەرەرەکە پـــڕ بکاتەوە ، بۆیە دەبێ ماوە بــــــۆ قازانج بەشە راکەت لە نێوان د وو کەسەکەدا دانە نرێ ، بەڵام هـــەر کاتێ هەر لایەکیان ویستی دە توانــێ کۆتایی پێ بهێنێ و، ( تـصـفـیـــــە)ی حـسـابـــات بـکـەن .

**حیکمەتی قازانج بەشەراکەت :**

گەلێ جار وا دەبێت کە سێـــــک پارەیەکی چاکی هەیە ، بــــــەڵام بازرگانیی نازانێ ، یان ناتوانــێ ، لە هەمان کاتـدا یەکێکی تر هـەیـە لاوێکی خوێن گەرمە و بازرگانـــــــی دەزانێت و دەشتوانێت ، بــــەڵام بێ پارەیە ، دەبا ماڵی ئەو وو کـــاری ئەم تێکەڵ ببن بۆ ئەوەی ماڵەکە نە مرێت و بکەوێتە گەڕ ، تـــــا بەرهەمی لێ پەیدا ببێ بۆ هەردوو لایـان .. بۆیە فیقهی ئیسلام ئـــــە و مامەڵەیە بە مامەڵەیەکی ئابووری ناسیوە و ، ڕەوای بینیوە و ، خەڵکی بۆ بانگ و دڵخۆش دەکات .

کێ ضامنی تیاچوونی ماڵەکەیە ؟

ماڵ هـــی خاوەن ماڵە و، ئەگەر خوا نە خواستە تیاچوو ( عامل ) ەکـــە ضامن نییە ، خۆ ئەویش زەرەری هاتوچۆو خەریک بوونی کردووە و ، هەروەها سزای ئاڵوگۆڕو مانـــــدوو- بوونی ڕێگای چەشتووە . تەنها لـــە یەک حاڵەتدا ضامن دەبێ و ماڵەکـــەی پێ دەبژێررێ ، ئەو حاڵەتەش ئەوەیە کە بە(ویستی تعدا ) خۆی ماڵەکە لە ناو ببا ، جا چونکە عاملەکە هەڵبژاردە و ئەمینی( ربّ المال) خۆیەتی ، هەروەها بە ئاسانی و بێ بەڵگە(اتهام)ناکرێ،ئەم ( عامل ) ە ئەمینی خاوەن ماڵ بـــوو، لە کوێ ڕا وا خـائـیـن بوو ؟!

ئیتر با زیرەکیی گـــەنـجـــە دەستپاکەکانمان و ماڵ و پــــارەی

بۆ لاپەڕە (٢٢)

پێشەوا (حسن البنّا) وەکو موسڵمانێکی خەمخۆری هەموو کێشە ئیسلامییەکان، لەگەرمەی سەرگەرمیی بە کێشەی فەلەسطینەوە لە ساڵی ١٩٤٨ دا کاتێ کە برا موجاهیدەکانی بۆ گۆڕەپانی جیهاد ساز دەکرد، لە کاتێکدا کە شوێن پێی هەموو هەواڵێکی پەیوەست بە نەتەوەی ئیسلامەوەی هەڵدەگرت، هەواڵی کێشەی کوردیش کەوتە گوێی.

لە سەرەنجامی لێکۆڵینەوەی هەواڵەکانەوە دڵنیابوو کە حکومەتی پادشایی ئەو سەردەمەی عێراق ستەم لە کورد دەکات و مافی ڕەوایان پێشێل دەکات، لە سەر ڕێکی ترەوە وەکو زانایەکی ئاگا بە مێژووی ئیسلامی دەیزانی کە گەلی کورد یەکێکە لە گەلە ڕەسەنەکانی ئیسلام، بۆیە بە ئەرکی سەرشانی خۆی زانی کە نامەیەک بنێرێت بۆ حکومەتی ئەو سەردەمەی عێراق و، تیایدا داکۆکی لە کێشەی ئەو گەلە بکات و دەوریان لە مێژوودا ڕوون بکاتەوە.

لە ڕاستیدا دەقی نامەکە لە ژمارە (٢٤)ی گۆڤاری (المسلمون)ی ساڵی ١٩٤٨ دا بڵاوکراوەتەوە، لێرەدا چەند بڕگەیەک لەو نامەیە دەخەینە پێش چاوی خوێنەران:

پێشەوا (بنّا) دەڵێت:

گەلی کورد دەورێکی سەربەرزانەیان لە مێژووی ئیسلامیدا هەیە، ئەو مێژووەی کە بە دەرکەوتن و سەرکەوتنی (**صلاح الدين**) تاجدار کرا.. ئەوگەلەی کە چەندین زانای تێدا هەڵکەوتووە و، ئیسلامیان بڵاو کردووەتەوە و خزمەتیان کردووە..

**هەروەها دەڵێ:**

شۆڕشی کورد ئەگەر بەڵگە بێت لەسەر شتێ، ئەوا بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەوگەلە ستەملێکراوە، نەئەوەی خۆیان حەزیان لە ستەم و زۆرداری بێ.

گەلی کورد لە دڵسۆزترین گەلە موسڵمانەکانە دەرهەق بە ئیسلام.

**لە کۆتایی نامەکەیدا داوای کردووە لە حکومەتی عێراق کە بەپێی شەریعەتی ئیسلام کێشەی گەلی کورد چارەسەر بکرێت.**

**پەیامی ڕاستی**

---

پاشماوەی لاپەڕە(٢١):

ماڵدارانمان یەکێ بگرن و، بەرهەمی هەردوانیان کۆمەڵانی پێ زیندوو و گەش بێتەوە .. وە با بزووتنەوەی بازرگانی هۆیەکێ بێت لە هۆکانی پێشکەوتنی وڵاتمان لە ژێر ئاراستە و ڕووناکیی فیقهی پاک و خاوێن و تاقیکراوەی سەدان چەرخی زێڕینی بەرنامەی ئیسلام..

خۆشی و خۆشگوزەرانیی هەموان هەردەم لە خوا دەخوازین.

تائەڵقەیەکی تر خواتان لەگەڵ.

مثنیٰ أمین نـادر

گومانی تێدا نی یە کە پێویستە هە موو موسلْمانێکی دلْسۆز بیر لـــــە وە بکاتە وە کە لێنێکێ بۆ ئیسلام و موسلْمانان پڕ بکاتە وە و، لە و ڕێگایـــــە وە بە رهە م و تواناکانی خۆی بخاتە کار بۆ خزمە ت کـردن .

چونکە بە لْگە نە ویستـــــە کـــە ئادە میزاد ـ بە شێوە یە کی گشـــتی ـ ناتوانێ بە هە موو بوارێکدا بگات و، خۆ پە رتە وازە کردنیش لە نێـــوان چە ند بوارێکدا دە بێتە مایـــــەی پە رتە وازە کردنی توانایی یە کانـــی مرۆڤ و، سە رنە کە وتنی شـــیاو و پێویست لە هیچ بوارێکدا .

بە لاّم ئە گە ر ئێستە سە رنجێکی واقیعی موسلْمانان بدە ین بارێکی ناساز دە بینین لە گە لْ جێ بەجـــێ کردنی ئە و ئە رکێ و پێویستی یەدا !

چـۆن ؟

دە بینین زۆر کە س هە رنەگە یشتووە بە و ئاستە هۆشیاری یە ی کە خـــۆی بە بە رپرسیار بزانێت سە بارەت بە وزە و تواناکانی و، بیر لـــــە وە بکاتە وە کە خۆی تە رخان بـــکات بـۆ پڕکردنە وە ی کە لێـــــن و سە نگە رێکێ و ، ئە رکی سە رشانـــی

ئـه نجام بـــدات .

له به رانبه ريشه وه كۆمه ڵـێـكى تر ده بينين كه هه ست به بەرپرسيارى ده كه ن و، ده زانن كه پێويسته لـــه بوارێكدا خۆيان ته رخانــى خزمـــه ت كردن بكه ن ، به ڵام به رنامه يـه كـــى په روه رده يى په يره وى كراو نـى يـــه له ژيانياندا كه رێگـاى به جێ هێنانـى ئـه م پێويستـى يه يان له به رده مـــدا ئاسان بكات و، بـيانخاته سه ر راسته شه قامـى به جێ هێنـانـى ئـه و ئـه ركه گـرنـگ و چـاره سازه .

زۆرێكى تريش له واتـــــــاى راسته قينه ى ئه م ئه ركه تێنەگەيشتوون په يبان به زۆرێك له تواناكانى خۆيـان نه بردووه، جا كاتێك كه ده بينيت لـه ئاستى كارو زانينـى خۆيان رازيـــن و، وا ده زانن ئه ركى به ندايه تى يـــــان ئـه نـجـــام داوه .

ئـا لێره دا باس دێته ســــــه ر تايبه تمه نديى ( الاختصاص ) يــــا پـسـپۆرى و ، گرنگى يه كه ى له بـوارى كارو كۆڕين و تێـكۆشانـــدا .

بارو ئاستێكى دڵگرانكەرو جـێـى داخـه كه ئه مرۆ موسڵمانان ـ بـه شێوه يه كى گشتى ـ وه كو ( الأوانـــي المستطرقة ـ ده فره به يه كـــه وه نووساوه كان ) له يه كو ئـاســـتى رۆشنبيرى دان ، كۆمه ڵه زانيـــن و رۆشنبيرى يه كى سه ره تايى لــــه باره ى : ئاينين و، بانگه وازو،مێژوو وه راميارىي جيهانـى و، ئابوورى و، جـوگرافياو،... و، هتدو، ئيتر هيچ!!

ئا لێره دا به هه لى گونجـاوى ده زانم ئه و راستى يه بـه زه قـــى بدركێنم كه : تا له و قـاوغه ته سـكه دواكه وتووه نه يـه ينه ده ره وه ، نه له ئاستى دين و بانگه وازه كه ماندا ده بين ، نـه وه كو پێويستيـــــــش ده توانين به ئه ركى خۆمان هه ستين.

به ڵـێ، زۆر پێويستمان بـــه وه هه يه كه سه ره راى رۆشنبيرى يەكى قووڵى گشتى تايبه تمه نديێتيمـــان له بوارێكدا هه بێت .. بوارێكـــــى گونجاو له گه ڵ خۆمانـــــــدا و، پێويست و گرنگ بـــۆ بانـــگه واز لـه م رۆژگاره دا .

ببينه پياوى ئه و مه يدانــــــه و ،

سه ربازی فیداکاری ئه و سه نگه ره و، به جوانترین نوێنه رایه تیی موسڵمانان، که سانی تر ده ست به تاڵ بکه ین بۆ بواره گرنگه زۆرکانی تری ژیان ..

گرنگیی تایبه تمه ندێتی بۆکۆمه ڵ له وه دایه : سیمایه کی به ربڵاو ده به خشێت به کاری ئیسلامی و، رێگا ده گرێت له ته سکبوونه وه له جوغزێکدا .. واته به جوانترین شێوه توخمی ( شمولیّة) دێنێته دی و هه موو توانایی یه کانی کۆمه ڵ ده خاته کارو، رێگا نادات هیچ لایه نێک به چۆڵی و پشت گوێخراوی بمێنێته وه . هه ر به و شێوه یه ش رێگا ئاسان ده کات و بناغه داده نێت بۆ رۆژگارێک که موسڵمانان بتوانن پێشره ویی هه موو بواره کانی ژیان بکه ن له ناو کۆمه ڵداو، ژیانێکی ئیسلامیی راسته قینه بهێننه دی .

وه له ئاستی تاکه که سیشدا تایبه تمه ندێتی وزه و توانایی یه کانی مرۆڤ خڕ ده کاته وه و، مه به ستداریان ده کات و ، سه رکه وتن ده به خشێت به هه ر ره نجێک که ده کێشرێت و، رێگا له به رده م داهێنان (إبداع) دا ئاسان ده کات و، هه ر که سه له گه ڵ به رپرسیارێتی و ئه رکی خۆیدا روو به روو ده کاته وه .

له ناو کارو زانینی گشتی و به ربڵاودا که م که س سه رکه وتن به ده ست دێنێت .. به ڵام له تایبه تمه ندێتی و یه کبواریدا هه موو که س ده توانێت ئه ندازه یه ک له سه رکه وتن به ده ست بهێنێت..

جا ئا لێره دا گرنگی یه کی تری تایبه تمه ندێتی ده رده که وێت که بریتی یه له رێگاگرتن له وه ی هیچ که س که م ده ستی و که م توانایی خۆی بکاته به هانه بۆ له ژێر بار ده رچوون و له به رپرسیارێتی راکردن .

(سه له ف ) - خوایان لێ رازی بێ - به رێنمووی پێغه مبه ر (درودی خوای له سه ر بێ) به سه ر بواره کاندا دابه ش بووبوون و، هه رکه سه له بواری خۆیدا سه رکه وتنی به ده ست

هێنابوو ، ( أُبي بن كعب ـ سیّد القراء ) و، ( حسّان ) شاعیری پێغه مبه رو، ( حذیفه ـ كاتم السّر ) و، ( زیدی كوڕی ثابت ) له ( فرائض ) داو، خالد له شمشێرداو، ( أبوبكر ) له به ڕێوه بردندا و ، هتد .

من پێم وایه كارێكی گه وره و گران نی یه هه ر كه سێك له ئێمه ـ هه رچه نده توانایشی كز بێت ـ بوارێك بۆ خۆی هه ڵبژێرێت به پێی به رنامه یه كی ڕۆژانه یاخودهه فتانه خۆی له گه ڵدا ماندوو بكات و، به و شێوه یه تایبه تمه ندێتیی بۆ خۆی دابین بكات .

جارێك له گه ڵ لاوێكدا كهوتمه گفتوگۆ، پرسیاری خوێندنم لێ كرد ، وتی : " له به ر چه ند هۆیه كی سیاسی له كۆتا ساڵه كانی (إعدادیة) وه وازم له خوێندن هێناوه " ، منیش وتم : " جا بۆچی خۆت سه رگه رمی خوێندن نابیت ؟ " وتی : " جا چۆن ده بێت ؟! " وتم : " زۆر ئاسانه !! بۆ نموونه تۆ ده توانیت مێژوو هه ڵبژێریت ، كۆمه ڵێك سه رچاوه ی باش كۆبكه یته وه و، هه موو ڕۆژێك دوو سه عات ته رخان بكه بۆ خوێندنه وه و پشكنینی ئه و سه رچاوانه و، ئه وه ی گرنگه كورتی بكه ره وه و ، له به ری بكه و، قووڵ به ره وه له باسه كه دا ، من دڵنیام له ده رچوویه كی به شی مێژووی كۆلیجی ئادا ب سه ركه وتووتر ده بیت .. ئه گه ر نه ك چوار ساڵ ، سێ ساڵیش به رده وام بیت .

ئه فسوس ئه مڕۆ ژماره یه كی زۆر له لاوان نرخی توانایی یه كانی خۆیان نازانن و، ده ستیان له بیناكردنی كه سایه تی زانستی و بیری و ڕه وشتیی خۆیان هه ڵگرتووه و ڕازی بوون به و ئاست و باره ی تێدا ده ژین ، له كاتێكدا به ره و خواچوون و ئیسلامه تیی ڕاسته قینه یانی : ڕازی نه بوون و قایل نه بوون به وئاست و قۆناغه ی موسڵمان تێیدا ده ژی و، هه ردم ته قه لالای

به ره ویێشه وه چوون و به رزبوونه وه.
ئا لێره دا به هه لی ده زانـــم ئه و تێبینی یه په روه رده یی یــه گرنگه بخه مه وه یاد که ناوی ده نێیــن **( سکێچی په روه رده یی )**، چونکه به‌ راستیته نها رێگایه بۆپه روه رده کردنی کارامه تایبه تمه نده کانی دوا رۆژ ی کاری ئیسلامی، ئه ویش ئه وه یه: له کاتێکدا لاوان و قوتابیان به ره وه رد ده کرێن پێویسته هه ر له سه ره تاوه په روه رشکاران و مامۆستایــان که سایه تیی دوارۆژیان بریاربده ن، وه وه ک نموونه و وێنه یه ک یاخود سکێچێک هه میشه له به ر چاویاندا دابنێین و له به ر رۆشنایی ئــه و نموونه و وێنه بریاردراوه دا مامه له له گه ڵ توانایی یه کانی ئـــه و قوتابیانه دا بکه ن و، به جۆرێــک رێگایان بۆ بنه خشێنن که بموئامانجه له به رچاوگیراوه بـگه ن.

هه روه کو چۆن هونه رمه نـدی شێوه کاری (رسّام) نموونه یه کــی ئه و وێنه یه ی که بریاره دروستیبکات له به ر ده ستیدا داده نێت و[1]، لــه ژێر رۆشنایی ئه و نموونه یــه دا ره نگ و، به رگ و، ئه ســدازه و قه واره ی شیاو ده به خشێت بــه و وێنه یه ی که نیگاری ده کێشێت.

جا به پێی ئه م نه خشه یــه پێویسته هه موو قوتابی یه ک هه ر له سه ره تاوه وردبینـــانــه هه لده سه نگێنـدرێت و، بــه پێی حه ز و توانایی یه کانی خۆی بوارێکی بۆ هه لبژێررێت و، هه ر له سه ره تای ته مه ن و پێگه یشتنیه وه لــه و بــواره دا به هێز بکرێــت و، بخرێته ژێر چاودێری یه وه.

بۆ نموونه ئه گه ر ئێمه چــه نــد قوتابی یه کی تونادار که له وێنــه ی دوارۆژیاندا یاخود له سکێچه که یاندا بریاره ببنه (ئه دیب) بخه ینه ژێر په روه رده ی تایبه تیی هه ر لــه سه ره تای قۆناغی ناوه ندی یــه وه به خوێندنه وه و، کورت کردنــه وه و، راپۆرت نووسین و...هتد له بــواری ئه ده ب دا، من بروام وایــه و واش ده زانم گومانی تێدا نی یه کــه دوای ته واوکردنی قۆناغــی

ئامادەکردنی
ئەندازیار
صدیق عبد العزیز

نەخشەی تاجیکستان و دراوسێکانی

## طاجیکستان لە چەند دێڕێکدا :

- (طاجیکستان) یەکێکە لە (٦) کۆمارە ئیسلامیەکەی یەکێتی سۆڤیەتی جاران و، (دوشەنبە) پایتەختیەتی.
- لە خۆرهەڵاتیەوە ولاتی (چین)ە و، لە خۆرئاوایەوە (ئۆزبەکستان)و، لە باکوریەوە (قەرغیزستان) و (ئۆزبەکستان)ە و، لە باشووریەوە (ئەفغانستان) ڕووبەری خاکەکەی (١٤٣٣٠٠ کم٢)یە.
- دانیشتوانی (٥ر١) ملیۆنن .. ئایینی ئیسلام لە سەدەی یەکەمی هیجری دا ئەو ولاتەی ڕووناک کردەوە، بۆیە زۆربەی زۆری دانیشتوانی موسڵمانن .. بەڵام لە ئەنجامی سیاسەتی (٧٠) ساڵەی کۆمۆنیستەکاندا ڕێژەیان بوو بە نزیکی (٨٠ ٪)ی دانیشتوان.

- ئه م ولاّ ته به كشتوكالّ و له وه رو پیشه سازی به ناوبانگه .
- ( روسیا ) سالّی ۱۸۹۵ ده ستی گرت به سه ریدا ، ( سوپای سوور ) یش سالّی ۱۹۲۱ داگیری کرد .
- له ژیّر چه پۆكی كۆمۆنیستدا مایه وه ، تا ۱۹۹۰/۸/۲٤ دا سه ربه خۆیی ئاشكرا كرد پاش رمانی كۆمۆنیست له یه كیّتیی سۆڤیه ت دا .
- موسلّمانه كان حكومه تیان گرته ده ست له گه لّ هیّزه دیموكراتخوازه كاندا پاش لادانی ( رحمن نبییف ) ی سه رۆكی شیوعی .
- پاش چه ند رووداوو كاره سات شیوعییه كان دسه لاّتیان گرتەوه ده ست و، له ئه نجامدا ( ۱ ملیون ) موسلّمان ئاواره بوون و، زیاتر له (۱۰۰ هه زار) كوژراون و، (۳۰۰ هه زار ) بریندار بوون .

ئه مجاره له شویّنیّكی تری ئه م سه رزه مینه پیلان ده گیّرریّت و نه خشه داده ریّژریّت و هه ولّی بیّ وچان ده دریّت بۆ لێبدانی ئیسلام و له ناوبردنی موسلّمانان ...

له طاجیكستان .. له و ولاّته دا كه (۷۰) سالّ به ندكرابوو.. (۷۰) سالّ دانیشتوانی بیّ به ش كرابوون له هه ر جۆره جموجوولّیّكی ئازاد.. نه تەوه یه كیّ كه (۱۳۰۰) سالّ بوو نووری ئایینی خوا گه شی كردبوونه وه و چاوو دلّی رۆشن كردبوونه وه . ده یانویست بالّی ره شیان به رده وام به سه ریانه وه بیّ و ، تاریكی یه كیّ كه خۆیان له نه زانی و نه دانی یانه وه تووشی بووبوون ئه وانیش به ردەوام ها پۆشیّ. به لاّم وا گزنگی خۆری به رنامه ی خوا - پاش رمانی قه لاّكه یان - جاریّكی تر ده ركه وته وه و، پرشنگی ده داو، سه رتاپای ناوچه كانی ئاسیای ناوه راستی گرتۆته وه به تایبه تی طاجیكستان .

له و ولاّته دا تاكه كۆمه لّی بلاّو و باوه رپیّكراو لای خه لّك

( پارتی راپه ڕینی ئیسلامی ) بـــوو، که بۆ چه ند مـانگێکیش لـه گــــه ڵ کۆمه ڵه دیموکراتخوازه کانـــــــدا ده سه ڵاتـیان گرته ده ست ، تا ئـه و کاته ی دوژمنانی ئایینی خوا بێـدار بوونه وه و، زانییان که ئـه مـــــه گه وره ترین مه ترسی یه بۆیـــــان و، ئه گه ر کار وا بڕوات وڵاته تــــازه سه ربه خۆبووه کانی تری ئـاســـیای ناوه ڕاست هه موو به و ڕێـــبازه دا ده ڕۆن ..

خه ڵکی **طاجیکستان** زۆر بــــه ی زۆریان بێزار بوون له بیرو بۆچوونـه نامـۆکان و، بێ سـوودی یانیان بـــۆ ده رکه وتووه و، به ئیسلام ڕازی بوون وه ک دین و یاساو به رنامه ی ژیــان، وه له قۆناغێکیشدا ده سه ڵاتــــیان که وتــه ده ست .. بـه ڵام ئـــــه ی بۆچیوا بـــه ئاسانی دوژمنانیـــــان توانییان بـه سه ریانـــــــــدا زاڵ ببـنه وه و، لـــه و ڕێره وی گۆڕیـــــنی ژیان و ( حـوکم ) ه لایان بـده ن ؟!!

٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪٪

**گــــۆڕانـــکاری و...**

**ده سه ڵات گرتنه ده ستی موسڵمانان:**

کاتێ بای گۆڕانکاری هه ڵی کـرد له یه کێتیی سۆڤیه تی جارانـــدا و، شنه ی گه یشته طاجیکستانیش .. کۆمۆنیسته کان ویستیان ده ست گیر بکه ن له ده سه ڵات له و وڵاتـــــه ، به ڵام دووبه ره کیی نێوان خۆیان بوو به هۆی لابردنی (**قهار محماکوف**) و دانانی ( **أصلا نوف** ) له جیاتیی ،که ئه م هه رزوو حزبی شیوعیـــــــی هه ڵوه شانده وه .. به ڵام په رله مان ـ که ٩٥٪ ی ئه ندامه کانی له حزبی شیوعین ـ به م کاره ڕازی نه بـوون و ( أصلا نوف ) لابرا و،(**رحمن نبییف** ) کۆمۆنیســــــتی تۆخ دانرا به سه رۆک٠

کۆمۆنیسته کان ســـه رۆکـــی شاره وانیی ( دوشه نبـــــــــــه)ی پایته ختیان گرت .. ئه م پیـــــاوه ده وریکی گه وره ی هه بوو له لابردنی په یکه ره که ی لینین دا ، کـــــه(١٦) سه عاتی به رده وامی خایانـد !

له ئه نجامدا خۆپیشاندان دروســـت

بوو لە ولاتــدا .. نەيارەكـــــان داوای سەرەكی یان لابــردنـــــی (كنجاییف) ی سەرۆكی پەرلەمـان بوو، حكومەت لەگەڵ نەیاراندا لە گۆڕەپانی (شەهیدان) بـەرەو ڕوو بووەوە .. خۆپیشاندەرەكان چوونە ناو پەرلەمان و، پاشان كۆشكـــی كۆماری و، لە ئەنجامدا ســەرۆك ڕایكردە ناو دامەزراوەی (مخابرات) كە ٧٠٪ ی ڕووسی بوون.. دواییـــش دەستیان گرت بەسەر ڕادیـــۆو تەلــەفیزیـۆنــدا .

بەم شێوەیە و، پاش ئـــەم ڕووداوانـــە حكومەتێكـــی چەند لایەنـــە پێكهات لـــە موسلمانەكان لە (پارتی ڕاپەڕینی ئیسلامـــی) و دیموكراتخوازەكان لە بـــەهـــاری پارداو، (أكبر شاه أسكندرۆف) كرابە سەرەك كـــۆمـــار .

بەڵام هەروەك هەمیشە دوژمنانـــی ئازادی و سەربەستیی ڕاستەقینـە نەیانهێشت ئەم حكومەتە ساوایە خۆی بگرێت و، ویست و خواستـــی تاجیكی بێتە دی . بۆیە چەنـــد لایەنی سەیری جیاواز لـە بـــیرو بۆچوونـدا ترسی پەیدابوونـــی كۆمەڵێك و دەسەڵاتێكی ئیسلامـــی یەكی خستن و ، ڕێككەوتن لـە سەر پەرە پێدان و چەكپێــــدان و یارمەتیی كۆمۆنیستەكانـــــی تاجیكـــستان جارێكی تـــر .

**پیلانی چەند لایەن دژی ویستیگەل:**

ولاتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا دەستی كرد بە ناردنی چەك بـــە بیانووی شتومەكی فریاگوزاری یەوە بە هاری ڕابردوو پاش لافـــاوە

وێرانکاره کان .

هه روه ها نزیکه ی(٥٠ هـــه زار) سه رباز له هێزه کانی ( ڕوس ) لــه و ولاته دا ماونه ته وه و، به نوێترین چه کێبه هێزکراون .. که جێی خۆیه تی طاجیکیش و ئێمه ش بپرسین: بۆچی ئه و هێزانه ماونه ته وه ؟! ئـــه ی

نه یانوت ئه گه ر سه ربه خۆبـــوون ده کشێینه وه ؟ ئه ی بۆچی لــــه کۆماره کانی ( به لطیق ) ـ کـــه ڕیژه ی موسلمانان تیا یداکه مــه ـ کشانه وه ؟! ته نانه ت ئـه فســـه ره ڕووسی یه کان له هه نـــدێ لـــــه جه نگه کاندا به شداری یان کــــرد به تایبه تی جه نگی ( کورغان ) کـــه بووه هۆی کاول کردنی ئه و شاره .. هه روه ها ئه و ڕووسی یانه ی کــــه

له سنووری طاجیکستان ـ ئه فغانستان دان یارمه تیی گواستنه وه ی چه کیان ده دا له بازرگانه کانی چه کێ و لــــه میلیشی یه کانی ( رشید دستـــــم )ی پاشماوه ی کۆمۆنیسته وه لـــــــه ئه فغانستان بۆ کۆمۆنیسته کان .

هه روه ها ( ئۆزبه کستان ) بــــه شێوه یه کی ئاشکرا یارمه تـــــی کۆمۆنیسته کانی ئه و ولاته ده دات ، ئه وه تا بێ ئه رمانه ـ وه کێلـــــه هه فته ی یه که می ئه م مانگـــــه دا واته مانگی ئازارهه واله کان ڕابـــان گه یاند ـ فڕۆکه کانی ئۆزبه کستـــان بـــۆمبارانی شاری ( قه رن ) یـــان کردووه پێش گرتنه وه ی له لایـــه ن کۆمۆنیسته کانه وه .

هه روه ها ( قه رغیزستــــــــان ) و ( کازاخزستان ) هه ریه کێ له ترسی بارودۆخی ناوخۆیی خۆیان و، بـــه شێوه ی جۆراوجۆر یارمـه تـــــیی کۆمۆنیسته کانیان ده دا .

له ( کولاب ) ه وه جه نگێ ده ستی پێ کرد.. بکوژو ببڕ ده ستیان کرد به ئاواره کردنی خه لکێ .. بــــــه ره و

( کورغان ) هاتن .. لەوێ هێزەکانی ( پارتی ڕاپەڕینی ئیسلامی ) بە سەرۆکایەتیی ( محمد شریف همت زادە ) بەرەنگاریان بوون، وە شکاندیانن .. بەڵام هێزە ڕووسییەکان هاتنە دەنگ بە بیانووی ناوبژی بەوە دەستیان کردە وە بە هێرش و کوشتاری خەڵک .

دوای ماوەیەک،لە مانگی (١٢) ی ساڵی (١٩٩٢) دا ، وە پاش جەنگێکی دووهەفتەیی هێزە تێکشکاو و ڕسواکراوەکەی دوێنێ - کە بێ فەرمانە ڕەتڵێک لە فڕۆکە و تانک و زرێپۆشی

بوون - چوونە پایتەختەوە و، بوونە وە بە دەسەڵاتدار .. بەڵام چۆن چوونێک؟

( امام علي رحمانوف ) ی سەرکردەیان فەرمانیدا بە حەڵاڵکردنی شار بۆ هێزەکانی بۆ ماوەیەک هەفتە..

لەم ماوەیەدا لاشە لە سەر شەقامەکان بڵاوبوونەوە بێ ئەوەی کەس بوێرێت تەنانەت لێیان نزیک ببێتەوە ، چونکە هەمان چارەنووسی بۆدە بوو .

**دڕندەیی کاری ستەمکارانە :**

دزی و تالانی و دەستدرێژی کردن هەستی خەڵکیی دەهەژاند..

هێزەکانی کۆماری ( ئۆزبەکستان ) لە پێشیانەوە

هەر کەس گومانیان ببردایە نەیاریانە یەکسەر دەیانکوشت..

به تایبه تی ئه نداماني پارتي
راپه ڕینی ئیسلامی ، که پێشتر بۆ
ئه و مه به سته ناوئامادە کرا بوون
به لیسته.. له هه مه جی تریـن
ڕه فتاردا پێشێلی بیروباوه ڕی
خه ڵکیان ده کرد.. هه رکه س
بیانزانبایه قورئانێک یا کتێبێکی
عه ره بی یا ته نانه ت نووسینێکی
سه ر ڕۆژنامه یه ک یا به رماڵێکی
پێ به ده یانکوشت .. ئه م
تاوانبارانه زۆر بێ شه رمانه وێنه ی
به رازو ئافره تی ڕووتیان له سه ر
لا په ڕه کانی قورئانی پیرۆزده کرد.
کوشتنی
منداڵو
پیرەژن ،
سووتاندن،
کاولکردن،
ئه تک
کردنی
لاشه ی
زیندووی
بێ گوناه .. ده ستدرێژی کردنه
سه ر ئافره تان .. ئا ئه مانه و
زۆرێکی تریش کاری ئه و
پاڵه وانانه بوو ، که ده یانوت :
" گۆرباچۆف و یه ڵتسین لا یان داوه
له ڕێبازی کۆمۆنیستی ڕاسته قینه !"
دژی (٧٠٪) ی گه لێک که تاکه
داوایان ئه وه بوو که ئیسلام ببێته وه
به یاساو به رنامه ی ژیان .
ئه نجامی ئه م کاره دڕندانه ش زیاتر
له یه ک ملیۆن طاجیکی له ناو
طاجیکستاندا ئاواره بوون و،(٢٠٠)
هه زاریش ڕوویان کردۆته
ئه فغانستانی هێشتا بریندار به و
بێ ده رامه تی یه وه ..

هه روه ها
(١٠٠)
هه زاریش
شه هید
بوون و،
(٣٠٠)
هه زاریش
بریندار.
بینه رانێک ده لێن ڕووباری
( جیحۆن ) ی نێوان طاجیکستان و

ئه ڤغانستان چه ند سه عاتێکێ ره نگی سووری گرتبوو به خوێنی زیاتر له (١٠) هه زار موسڵمان که له ڕۆخی ئه و ڕووباره دا سه ربڕرابوون..!
ئه مه حاڵی ئه م گه له هه زاره موسڵمانه یه که داوای ئازادیی ڕاسته قینه ده کات .
له وانه یه زۆربه مان به هیچ شێوه یه کێ باسێکمان ده رباره یان نه بیستبێت ، به تایبه تی به هۆی ئه و بێده نگی یه سه یره وه که له ده زگاکانی ڕاگه یاندنی ولاّتانی جیهان و جیهانی ئیسلامی دا به دی ده کرێت و، بێده نگیی "سیستمی نوێی جیهانی" که بۆ هه ر شوێنێکێ سوودێکی خۆیانی تێدابێت هه ستیان ده بزوێ و دڵیان ده سووتێ ، له کاتێکدا کاره ساتی ( طاجیکستان ) و لێدانی دیموکراسی و ویستی گه ل له زۆر شوێن گرنگترو زه قتره .

**تاقیکردنه وه ی طاجیکستان بۆ سه ری نه گرت :**

گه لی طاجیکی به هه ر شێوه یه کێ بووه ئیسلامیان ده وێ . ئه وه تا ( سلیمان طوغان ) ده ڵێ :
(( پیره کانمان له ته مه نی (٨٠ ـ ٨٥)) ساڵیدا ده ڵێن : ڕاسته ڕووس زۆریان ده خستینه سه ر بۆ له بیربردنه وه ی دینه که مان ، به لاّم قینمان دژی ڕووسی کافر یه کێ ڕۆژ له بیر نه چووه .. له نیوه شه ودا که ئه وان ده خه وتن هه ڵده ستاین نوێژمان ده کرد و قورئانمان ده خوێند )) .
سه رکرده موسڵمانه کانیش ده زانن گه ل سته ملێکراوه و، هه ر ـ چی بڵێن گه ل جێ به جێی ده کات گه ر بڵێن بچنه سه ر جاده ، ده چن، به لاّم ده زانن ئه وان ـ واته کۆمۆنیسته کان ـ وایان پێ خۆشه تا له ناوبردنیان ئاسان بێت . بۆیان ده رکه وت که هه رچه نده زۆربه ن به لاّم تووشی جه نگێ بوون ، له گه ڵ ئه وه شدا نه چه کێ .. نه یارمه تی.. نه پیلانی سه ربازی .. نه تاقیکردنه وه و ( تجربه ) .. نه فێڵی سیاسی .. نه ته کتیکی عه سکه ری یان نه بوو، ئه مه جگه

له بێده نگیی جیهانی ئیسلامی وه کێ باس کرا.. ئه مانه وه لامی ئه و پرسیاره بوون که له سه ره تادا کرد مان که بۆچی ئه م تاقیکردنه وه ی طاجیکستانه سه ری نه گرت ..؟

ئێسته شیوعی یه کان ده لێن گوایه ده سه لاتیان به سه ر (٩٠٪) ی بارودۆخ دا هه یه ، به لام هه واڵه کان ده لێن ئه وه ته نها له چه ند شارێکی که م دایه و، وا موسڵمانه کان که وتوونه ته خۆکۆکردنه وه و خۆ ڕێکخستنه وه به جۆرێکی سه رنج ڕاکێش بۆ به ره وڕووبوونه وه ی حکومه تی به زۆر سه پێنراو، هه روه ها بۆ یارمه تیی ئاواره و بێ لانه بووه کان و، گه یاندنی کێشه ی **طاجیکستان** به جیهان ...

به هیوا و نزا بۆ سه رکه وتنی ڕاستی و، ویست و خواستی ئه و گه له به شخوراوه له په روه ردگاری تۆڵه سێنه ر .

* سوود وه رگیراوه له گۆڤاری :

الاصلاح /ژماره(٢٢٠ـ ٢٢١ـ٢٢٤)

العالم/ ژماره (٤٦٨).

باشماوه ی لاپه ره (٢٨) :

دواناوه ندی ـ هه ر به و شه ش ساڵه ـ ده بنه ئه دیبێکی گه لێ سه رکه وتوو، قه ڵه م ڕه وان و، داهێنه ر .

له کۆتاییدا ، ئومێده وارم چی دی هه ل به زایه نه ده ین و، له دواکه وتوویی و ئاست نزمی خۆمان ڕزگار که ین و، بوارێک بۆ چالاکی، ڕه نج و، خه بات و، خوێندنه وه ی خۆمان دیاری بکه ین و .

په روه رشکارانیش به که لک وه رگرتن له سکێچی په روه رده یی که له پیاوانی دوارۆژمان بۆ بخه نه ڕێ .

(١) ئه و نموونه یه به زاراوه ی هونه ری پێی ده لێن (سکێچ) .

مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا « المائدة / ٣٢ »

هەرکەس یەکێک بکوژێ بە ناهەق یا بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی فەساد لە زەویدا، وەک ئەوەوایە کە هەموو خەڵکی کوشتبێ. وە هەرکەسێ زیندووی ڕاگرێ - واتە نەهێڵێ بکوژرێ - وەک ئەوەیە کە هەموو خەڵکی زیندوو کردبێتەوە.

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالب (خوای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێت: ((لە بەخشینی کەم شەرم مەکە، چونکە نەبەخشین لەو کەمترە ..)).

سُئل رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عن اكثر ما يدخل الناس الجنة ؟ قال : (( تقوى الله و حسن الخلق)).

رواه الترمذي ، حديث حسن صحيح .

واتە: پرسیار کرا لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێ) لەوەی کە زۆرتر مرۆڤ دەباتە بەهەشتەوە؟ فەرمووی: (پارێزکاری و ڕەوشتی جوان).

● ● ● ● ● ●

... هەمەرەنگ .... هەمەرەنگ .... هەمەرەنگ
پەندێکی ئەمریکی :
ئەوەی ئاسان بەدەست بێت .. ئاسان لەدەست دەچێت .
پەندێکی کوردی :
ئەو کانییەی ئاوت لێخواردەوە .. بەردی تێفڕێ مەدە .
چەند ساتێک لەگەڵ ژمارە (٩) دا ......
ژمارە (٩) بدە لە هەر ژمارەیەک ئەنجامەکەی کۆ بکەرەوە - واتە ژمارەکانی - جارێک ، دوو جار ، یا هەر چەند جار بێت ، ئەنجام هەر دەکاتە (٩) .. بۆ نموونە :
٩× ٧ = ٦٣ ← ٣+٦=٩ .
٩ × ٤٣ = ٣٨٧ ← ٧+٨+٣ = ١٨ ← ٨+١ = ٩ .
٩ × ٨٨٨ = ٧٩٩٢ ← ٢+٩+٩+٧ = ٢٧ ← ٧+٢ = ٩ !
بۆ زانین : حوتی شین زەبەلاحترین دروستکراوانی سەر زەمینە.. لە درێژی و قەبارەیدا هێندەی فڕۆکەیەکی (١٠٠) نەفەری دەبێت .. بارستاییەکەی دەگاتە (١٩٠) تۆن .. خێراییەکەی دەگاتە ٣٧ کم/سەعات .. کۆرپەلەی ٦٫٥ تا ٨٫٥ م دەبێت و، بارستایی (٣٠٠٠) کیلۆ دەبێ کاتێ لە دایک دەبێ .

# به خته وه رترین مرۆڤ

ماموّستا
سه عیدی نوورسی
وه رگێڕانی
ماموّستا فاروق رسول یحیی

ماده م
دنیا فانی یه و.. ته مه ن
کورته و.. ئه رکێ و واجباتیش گه لێ زۆرن و..
ژیانی هه میشه یی ئه و دنیاش لێره و له م دنیادا به ده ست
ده هێنرێ وهه وڵی بۆ ده درێ و.. دنیاش بێ خاوه ن نی یه ، چونکه ئه م
میوانخانه یه په روه ردگارێکی ده ست ڕه نگین و داناى هه یه و، سزاو پاداشتی
خراپه و چاکه ی لێ ون نابێ و، هیچ ئه رکێک ناخاته ئه ستۆی به نده کانیه وه گه ر
له توانایاندا نه بێ..

هه روه ها مادام ڕێی ڕاست و ڕێ یه کێ ئازاری تێدا بێچون یه کێ نین و..
هاوه ڵان و پله و پایه کانی دنیاش تا ده رگای گۆڕ زیاترله گه ڵ مرۆڤ نایەن..
ئه وا به خته وه رترین مرۆڤ ئه و که سه یه که :
له به ر دنیا قیامه تی له بیر ناچێ و.. ئه و دنیای بۆ ئه م دنیا
نادۆڕێنێ و.. ژیانی هه میشه یی خۆیشی له به ر ژیانێکی دنیایی ناشێوێنێ و..
ته مه نیشی به شتێ که په یوه ندی به وه وه نه بێ، به فیڕۆ
نادات و.. به چه شنی گوێڕایه ڵیی میواندار ، فه رمانبه رداری
فه رمانه کانی خواوه ند ده بێ..
تاکو ده رگای گۆڕی به دڵنیایی و ئارامی یه وه لێ بکرێته وه،
بنه سه لام کرد نه وه پێ بخاته ناو خانه ی
به خته وه ری .

سه عیدی نوورسی

لقی سلێمانـــی

**ده زگای فریاکه وتنی ئیسلامیی جیهانی** به شایه‌تیی هه موو لایه‌کێ له م ماوه پێشووه دا یارمه تی‌یه‌کی باشی هه ژاران و فه رمانبه رانی ولاته‌که مانـــی داوه و، ده گونجێ له سه ر شاشه ی ته له فیزیۆن و ڕووپه ڕه ی ڕۆژنامــــه کان زۆرجار بانگه شه ی یارمه تی‌به خشین و چالاکییه کانیمان بیستبــێ.

بۆ ئه وه ی زیاتر له گه ڵ ئه م ده زگایه ئاشنا ببین و، له ده مـــــــــی به رپرسیارانیه وه ڕاسته وخۆ شتێکێ ببیستین هاوکارمان له سلێمـانی له لایه ن به ڕێز ئه ندازیار(کاکێ عثمان ) ه وه ئه م هه له ی بۆ ڕه خســا و، چاو پێکه وتنێکێ ساز بـــوو. لێره دا پاش سوپاس بۆ به رپرسیـــــــار و کارمه ندان و تێکڕای خێرخوازانی سه ر بــه و ده زگابـه ، وا ده قــــــــــی چاو پێکــه وتــنه که ده خه ینه ڕوو ..

په یامی ڕاستی: پێخوشحاڵــین پێناسه یه کی ده زگاکه تان بکه ن.

**کاکێ عثمان : پێشه کی‌به نــاوی خوای به خشنده ی میهره بانه وه .. پاش به خێرهاتن و ڕێزمان بــــۆ گۆڤاره که تان ، وه هیوای سه رکه وتن**

بەبەرنەوامی بۆی ..

دەزگاکەمان لقێکە لە نووسینگەی کوردستان کە چاوگەسەرەکی یەکەی (یەکگرتووی ئیسلامیی جیهانی) یە .. نووسینگەی کوردستان لە بەرواری ١٩٩٢/٤/١ دا لە زاخۆ کرایەوە، لە ١٩٩٢/٨/١ دا دەست بەکار بوو . وە لە سێ لق پێکهاتووە لە دهۆک و هەولێر و سلێمانی .

هەر لقێکیش لە چوار بواردا کار دەکات : بواری ئاوەدانکردنەوە، بواری فریاکوزاری ، بواری تەندروستی و ، بواری خزمەتکوزاریی کۆمەلایەتی .

پ . ر : مەبەست لە دامەزراندنی دەزگاکەتان چی یە؟

کاک عثمان : مەبەستو ئامانجمان خزمەتکوزاری و فریاکوزاریی هاوولاتی یانی موسلمانی کوردە . بێگومان ئەمەش ئەرکی سەرشانی هەموو موسلمانێکەو ، پێویستە پێی هەستێ، بەتایبەتی لەم بارو دۆخە نائاسایی یەدا، کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش زۆر گرنگیی پێداوە لە چەند لایەنێکەوە :

یەکەم : پشتگیریی گەلی ستەملێکراوی کورد.

دووەم : بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووریی هاوولاتیان بە بەخشینی کۆمەکی خۆراک و شتی تر .

سێیەم : ئاوەدانکردنەوەی کوردستانی وێرانەکراو لەسەر دەستی زۆرداران، کە زیاتر لە ٤٥٠٠ دێمان وێرانەکراوە .

پ . ر : سەرچاوەی کۆمەک و یارمەتیتان لە کوێوە یە ؟

کاک عثمان : ئەم دەزگایە دەزگایەکی خێرخوازەو ، پەیوەندی بە هیچ حکومەتێکەوە نی یەو ، یەکگرتووی ئیسلامیی جیهانی زۆر لە کۆنەوە بیری لەوە کردۆتەوە کە کۆمەک و یارمەتی کۆبکرێتەوە و بگەیەنرێتە گەلە ستەملێکراوەکانی جیهانی ئیسلامی کە گەلی کورد یش یەکێکە لەوانە .

پ . ر : چالاکی یەکانتان لەم چەندمانگەدا چی بوون .

کاک عثمان : هەرچەند لە

هۆكانی ڕاگه یاند نی هــه ریٚــــمی كوردستاند ا ـ به تـایبـه تــــــی ڕۆژنامه و ته له فیزیۆن ـ باسی ئه م پرۆژانه كراون ، به لآم لیٚره شدا بـۆ ئاگاد اركردنه وه ی خـویٚـنه رانـــی به ڕیٚزی ( په یامی ڕاســــــــتی) ئاماژه یان بـۆ ده كه ینه وه ..

یه كه م : لـه بواری ( ئــــــاوه دان ـ ـكـردنه وه ) د ا ، هه ستاوین بــه دروستكردن و چاككردنــــه وه ی (٣٣) پـرۆژه ی ئاو و مــزگـــــه وت و نەخۆشخانه و قـوتابخانه له شویٚـنـه جیاجیاكانی پاریٚزگای سلیٚمانــــی و كه ركوكدا ، به م شیٚــــوه یـــه ی خـواره وه :

١ـ مزگه وتی گـه وره ی خـورمـــالّ ـ دروســتكـردنـــه وه .

٢ـ مزگه وتــی كـانــی پـانــكـه ـ دروســتكــردنــه وه .

چـاككـردنــه وه ی :

٣ـ مــزگه وتــی گه وره ی چوارتا .

٤ ـ مزگه وتی كلكه سماق .

٥ ـ مزگه وتی حاجی میـنـه .

٦ ـ مزگه وتی ( عوسمانی كـــــوڕی عه ففان ) له هه لّه بجه ی شه هید .

٧ ـ مزگه وتی گه یلانی /هه لّه بجه

٨ ـ مزگه وتی گـیٚــلّه ره .

٩ ـ مزگه وتی قه لاّ چوالان .

١٠ ـ مزگـه وتــی عـه نـه ب .

١١ ـ مزگه وتی بـیاویٚـلّـه .

١٢ ـ مزگـه وتــی ( حيّ العسكری ) لــه كــفری .

١٣ ـ دروستكردنه وه ی قوتابخانه ی خورمـالّــی سه ره تـایــی .

١٤ ـ دروستكردنه وه ی قوتابخانه ی تـه گه رانــی سـه ره تـایـی .

١٥ ـ چاككردنه وه ی قوتابــخانـه ی بـه رزنـجـه ی سـه ره تـایـی .

١٦ ـ چاككردنه وه ی قوتابخـانـه ی چوارتـای سه ره تـایی .

١٧ ـ دروستكردنه وه ی بـنـكــه ی ته ندروستیی لـه خـورمــالّ .

١٨ ـ ته واوكـردنـی پرۆژه ی ئــاوی قه لاّچوالا نـی كـۆن .

١٩ ـ چاككردنه وه ی قوتابخـانـه ی بـامۆك له هه لّه بجه ی شه هید .

٢٠ ـ چاككردنه وه ی ئـامـاده یــی پیشه سازیی هه لّه بجه ی شه هید .

٢١ ـ چاككردنه وه ی ئاماده یـــی پیشه سازی كاره بای سلــیٚمانــی .

٢٢ ـ چاككردنه وه ی ناوه ندیی رزگاریی كچان / دوو قاعه ی وانه خویندن .

٢٣ ـ په یمانگای مامۆستایانی مه ركه زیی سلیمانی/چاككردنه وه .

دووه م : له ڕووی فریاگوزاری یه وه هه ستاوین به به خشینی (٤٠٠) تۆن ئارد و (١٥٠) تۆن برنج و ، به تانی به سه ر فه رمانبه رانی پاریزگای سلیمانی و كه ركوك و، زۆر له هه ژارو لیقه وماوانی ناوچه كه دا .

سییه م : له ڕووی خزمه تگوزاریی كۆمه لایه تیشه وه ، به خشینی پۆشاك وه پیلاو به سه ر منداله هه تیوو خیزانه بی نه واكانی قوربانیی ئه نفاله كاندا له ناوچه ی گه رمیان به كۆمه كی ( كۆمه له ی بووژاندنه وه ی ئیسلامیی ) كویتی له شارۆچكه كانی چه مچه مال، شۆرش ، ته كیه ، كفری ، سه رقه لا ، صمود ، ده ربه ندیخان و، كه لار .

چواره م : له ڕووی ته ندروستیشه وه ، بنكه یه كی ته ندروستیشمان له شارۆچكه ی كفری كردۆته وه و، توانراوه دوو دكتۆر و، كارمه ندو ده رمانی بۆ دابین بكریت بۆ هاوولاتیان .

پینجه م : به یارمه تی دلسۆزانی دائیره ی ( بیطری ) سلیمانی هه ستاین به كوتانی ئاژه ل و مه ڕو مالات له ناوچه ی شاره زوور.

شه شه م : دابینكردنی سووته مه نی بۆ بیره ئاوه كانی شارۆچكه ی صمودو خه سته خانه ی ( ویلاده) ی سلیمانی وه چه ندین فه رمانگه و قوتابخانه ی سلیمانی له چه ند مانگی ڕابردوودا .

حه وته م : به خشینی (١٢) هه زار دینار به زانكۆی سلیمانی و ، (١٨) هه زار دینار به په روه رده ی سلیمانی .

هه شته م : ئاماده كردنی سفره و خوانی ڕۆژووشكاندن له زیاتر له په نجا مزگه وتی شارو شارۆچكه كانی سه ر به سلیمانی و كه ركوك .

پ . ڕ : چالاكیه كانی هه ولیرو دهۆك چۆنن ؟

كاك عثمان : دهۆك و هه ولیریش به هه مان شیوه ی ئیمه كار ده كه ن و به شه و ورۆژ له خزمه تی خه لك دان .

پ . ڕ : نه خشه ی داهاتووتان چیییه ؟
کاکۀ عثمان : پشت به خوا له داهاتوودا نیازمان وایه :
١ ـ ده ست بکه ین به چاککردنه وه و بنیاتنانی (٦) مزگه وت و قوتابخانه یه کۀ له هه لّه بجه ی شه هید و ڕانیه و قه ره داغ و به ته مایشین خه سته خانه ی ده ربه نديخان گه وره بکه ین .
٢ ـ به رده وام ده بین له دابه شکردنی خوارده مه نی به سه ر هه ژاراندا .
٣ ـ هه ولّ ده ده ین تاقیگه یه کی ته ندروستی ( مختبر مركزي) بکه ینه وه له کۆتایی شه قامی گۆران له شاری سلێمانی و، هنکه یمکی ته ندروستیش له شارۆچکه ی شۆڕش .
پ . ڕ : دوا وته تان چیییه بۆ خوێنه ران ؟
کاکۀ عثمان : ده زگاکه مان له گه ڵ ئه وه دا که ـ سوپاس بۆخوا ـ سه رکه وتنێکی گه وره ی به ده ست هێناوه به شایه تی گشت لایه کۀ ، به لّام ئه گه ر هه رکه س تێبینی یه کی هه بێت پێمان خۆشه ئاگادارمان بکات .. یان هه رکه س پرسیارێکی هه بێت له باره ی ئیشه کانمانه وه با ڕاسته وخۆ بێته مه لّبه ند ، یا له ڕێی پۆسته و ته له فۆنه وه لێمان بپرسێ ، به پێخوشحالّی یه وه وه لّام ده درێته وه و ، له خزمه تی گشت لایه کداین . خوای په روه ردگاریش هه ولّ و کۆششی گشت لایه کمان وه ربگرێت .
ناونیشانمان : سلێمانی ـ شه قامی سه ره کیی ڕزگاری ـ نزیکۀ ( عماره ی عطار)/تطه فون ( ٢١٩٠٩ )
ده زگای فریاکه وتنی ئیسلامیی جیهانی
پ . ڕ : له کۆتاییدا سوپاسی به ڕێز کاکۀ عثمان محمد رشید ده که ین بۆ ئه م چاوپێکه وتنه .
خوا سه رکه وتووتان بکات .
کاکۀ عثمان : منیش سوپاستان ده که م .

زانــا رەزا

وردە وردە بوو لێڵی بوچوونە کانت دە رە واندە وە و،کازیوە ی بە خشندە ییت بە دی دە کرد.. دوابە دوای گزنگی ئاکامەکـــان بیری دە هە ژاندیت و بە رە و ئاسۆیە کی روون و بێگـــەردی دە بردیت ، پاشان دە توت گرنگ ئە وە یە ئاوی دێراوەکـــان لە باخڵەی خە مە کاندا ستاربگرن وتێرئاویان بکە ن ،گە ر بــۆ ساتێکیش بێت خە مرە وێن بن و، لە بن پاڵی ئازارە کان دا بــە ئارامــی بحەوێــتە وە .

ئە مانە و، زۆری ترت دە هێناو دە برد، هە ربۆیە ئە مجارە بە روویە کی گە ش و دڵفراوانی یە وە بە رە و رووی چــوویت و بە توندی دە ستە کانیت گوشی و، باوە شت پیاکرد، پــــاشان بیروبۆچوونەکانت لە بارئە ندازی ئە و داخـــــــــست و، وە ک ئە مانە تێک پێت سپارد بێ گوێ دانە ئە و راســپاردە رە شە مزگە رکراوانە ی کە دژوارانە بە تــۆی سپاردبوو.

بۆ هە ر شە وە زە نگێک خۆرێک و، بۆ هە ر تاریکی یــەک گزنگت دە هێنا ، زۆربە هێمنانە باسە کانت بۆ شی دە کردە وە و، وە ک ئە وە ی لە گە ڵ خۆتدا بدوێیت ، هە ر بۆیە ش بزە لـــە

لێوه کانت نه ده براو، گه شه ی زه رده خه نه ت به رده وام بوو، هه ستت به شادمانی یه کی زۆر ده کرد.. حه زت ده کرد بۆ هه تا هه تایی له گه ڵیدا بیت و هه رگیز ده ست به رداری نه بیت. پێشنیاره کانت بۆ بابۆڵه ده کرد نه با برسێتی هه ست وهۆشی کزو مات بکات و، ترووسکایی لێ ببڕێ و خامۆشی بکات.

هه رده م ئاگاداری بوویت و چاوه کانت لێ نه ده تروو کاند، چونکه ده تزانی با بردە ڵه یه و، زریان و ڕه هێڵه ڕیـــــشه ی ده رد یـــنــێ.

لێبوردانه له ده وری بوویت و چاودێری وشه کانی بوویت و ڕاقه ت ده کرد، نه با بۆزووی قسه کانی چوارده وری بێـــزار- بکات و لێی بته کنه وه و به ته نیا جێی بهێڵن و، به دوێژانـــه له قه ڵه مـی بــــده ن.

شه ونخوونیت به دیاریه وه ده کێشاو په راوه کانت بـــۆ بژار ده کرد، نه با به یاتی نووکی خامه ژه هراوی یه کان وه کۆ ئه و بزنه دۆخه ی لێ بکه ن که شیره که ی ئاغا تێر بکـــــا و قه تره ش بـــۆ خـــاوه نـــه که ی نه هێـــڵێـــته وه..

خۆت له یه کێ تویێ ڕووکاردا ده بینی یه وه.. بێ گوێدانه ئه م لاولای ڕه وگه ی دێراوه وشکه بێ ئاوه کان که گشت نه مامه- -کان تیایانـدا سیس و زه ردهه ڵگه راون و، سه رجه م گولاّ نـــی تیا ژاکاون ،کۆی ته رزه کان تیایانـدا بێ گه شه و بێ لق وپۆپن، له کاتێکیشدا مۆڵگه یان له ده وریان به ستبوو، مقۆمقۆی ئـه و به رهه مه وه همی یه خه یالاّوی یه یان بوو، که ئێستا نـــــــا تۆزێکی تر ده یچننـه وه، به لاّم بێ ئاگا بوون له وه ی کــــــه هێواشترین شنه ی با هێزی پێ ناهێڵێ و به ری ئاواتیان به با ده بات. ئه مجاره ش هێمنانه و دڵ ئارامانه هه ست و هۆشـی

خۆتت ساف کرده وه و، نه فره تت له و شه یتانه فێڵبازه کردکه جارجار ڕه شایی یه کی بێ سوود له به رچاوه کانته وه تێپه ڕ ده کات ، بێ ئه وه ی جورئه تی بۆ ته نیا ساتێکێ بکات له به رده مت دا، له کاتێکدا ئه و شه یتانه به په ڕوباڵ و نینۆکه تیژه کانیه وه له خوێن و لاشه ی به رانبه ره که ت دا له گه ڕ دایه و به خۆشترین هه وارگه ی داده نا، تا ته واوی ماندوێتی تیا ده ر بکات .

دڵسۆزانه ، به سروودی گه ڕانه وه لایلا یه ت بۆ ئه و مه لۆتکه قومات و زه ردهه ڵگه ڕاوه ده کرد، جارجاریش له بێشکه خنجیلانه که یدا ڕاتده ژاند و وه نه وزت به دیاریه وه ده کێشاو، پاشه ڕۆژیت وا دیاری کردبوو که هه مان وه نه وزو لایلایه له سه ر لانکه ی کۆرپه کانت دووباره بکاته وه ..

به هه موو شێوه یه ک لێبڕاو ده ست له ملی بوویت و، خۆت به خاوه ن ئه زموونێکی ئێجگار گه وره ده زانی و ، له به ینه ت و وه فای خۆته وه ده ترواني يه ئه و، به لام ده رکت به و ئاوێنه ڕه شه ده روونی يه نه کرد که گشت وێنه کانی ئاوه ژووانه بۆ ڕه وانه ده کردیته وه !

---

به به ینه ت : وه فا به یات : پاشماوه .

باخڵه : قوڵکه یه که له ده وری نه مام ده کرێت تا ئاوی تیا بوه ستێت .

بارئه نداز : شوێنی بارخستن .

بۆڕزوو : کارێ به شێوه یه کی ناڕاست ده ستکاری کرابێ و خه ڵکی له به ر چاوی که وتبێ .

- ١ -

من نامه وێت ..
جارێکی تـر ..
کیژه ڵووکەی مه رگه ساتێکێ
هه ڵکه نه وه و
به هارێکی دی ئه مگه له
سته مد یـده م
له خوێنی خۆی بگه وزێنن
په ڕه ی گوڵه جوانه کانی
نێرگسه کانی شاره زوور
بێ ڕه حمانه هه ڵوه رێنن !!

- ٢ -

قه ت نامه وێت .. جارێکی تر
وه رزێرێکی ،تۆو وه شێنی ئه مهه واره
به تۆمه تی : تۆو وه شاندن
بازۆڵه ی پڕ گورو هێزی
له زنجیر و
توندی کونجێکی زینـدان بێ
له جێی ڕێزو قه در زانین
به شی هه ر زریکه و ژان بێ !!

- ٣ -

هه رگیز قایل نه بووم .. ناشبم
جـارێـکی تـر ..
سه ری به رزی (به مۆ) ئاسای

ماموستا
جلال الـدين نجم الدين

هیچ ڕۆڵه یه کی ئه م کورده
به فه رمانی خوێنخورێکی زور ترسناکێ
به بێ تاوان ..
له په نادا
که که س شوێنیشی نه زانێت . .
به زیندوویی
بخرێته خــاکێ !!

- ٤ -

ڕازی نابم ..
جارێکی تـــر ..
شوان و گاوانی ئاوایی
به بوهتانی
کارکێرێتی ( ئۆپۆزیسیۆن )
ببرێن بۆ سه رنگون کردن
نه کێ بــۆ که مێکێ
بــێ کۆتــایــی !!

- ٥ -

هه رگیز نامه وێت ببیستم
جــاریــکــێتــــر ..
ده ستــه ی ستــه م
مه لــی هیــوای خــۆشبه ختــیی
خوشکێکی کوردم
له زینــدانــی تــه نگێ و تارا بخنکێنن
تــا ئازاده . .
وه کو نــێـچـــیر
هه زار داوی له ڕێ دانێن
به ش فرسه تی لێ گیر بێنن . .
ئه و کاته ش که له زینــدانــه
بێ شــه‌رمانــه
ئابڕووی به رزی
له گه ڵ له چکه پیرۆزه که ی
به تووڕه ییه وه بدڕێنــن !!

- ٦ -

من نامه وێت . . جارێکی تـر
خه وی خۆشی داروديواری شارکه م
به گرمه و ناڵه ی (T.N.T)
داچڵه کێنــن . .
یان بۆ تێریی کرمــی دڵیــان
گشت کانیاوو کارێزه کان
بــه کونــکرێــت
بــتاسێـــنن !!

- ٧ -

قه ت نامه وێت .. جارێکی تر
مناڵه کوردێکی داماو
بۆ ده ستکه وتی پارووه نانێ
وێڵی ئه م شارو ئه و شار بــێ
له گازیــنــۆ . .
له خه وتنــگا . .

له چێشتخانـــه ..
بۆ گشت ئاغایه كێ نـۆكـه رو
بۆ خزمه تكاریی نـاچار بـێ !!
+ + + + + + + + +
یان له بێـده ستی و نه بوونی
ده ستیدا وا پان كاته وه
هه ركه س شتێكی پێ به خشی
خۆیی بێت یان هه نده رانی
بێ یه كێ و دوو
خێرا لێی بقۆزێته وه و
بیرێكێ له وه نه كاته وه :
زۆر به خشنده
بۆیه هێنـده سه خی طه بعه
بـه ته مایـــه ..
له زێڕی ڕه ش
( یه كێ به ده ) سوو د بباته وه !!
- ٨ -
من نامه وێت .. قه ت ڕازی نیم
جارێكی تـر ..
زه ڕه قورسێــكـی نـاقـۆڵا
بێته سه ر كوچه و كۆڵانـم
بیپشكنێت ماڵ و گیانم
گوایه نامۆم و نامناسێت
ده بێت حه وت پشتی بۆ هه ڵده م
ئه وساكه ش هه ر لێم نه گه ڕێ و
وه كو هـار به ربێته گیانم !!
- ٩ -
من نامه وێت .. قه ت نامه وێت
جارێكـی تــر ..
تـرازیــدیــای ژیان بـین
هێرۆشیمای كوردستـان بیـن
له وه ش داخ تـــر
بێ كه ڵكێ و ســـوود..
ته نها بۆ مه رامی خۆیان
بنێشته خۆشه ی سه رده مـــی
ده م به تاڵانـــی جیهان بیـن !!
- ١٠ -
ڕازی نـــابـم ..
باباگوڕگوڕی ڕوو له خێر
هه ركه سه و هه رچۆنی بوێت
بیخواته وه ..
بیكاته دیاریی ئه م و ئـه و..
بیرژێنـــێ .. بیپژێنـــێ ..
له دوای تێریش
له جیاتی شوكرو پێ زانین
چه كوشی نه وتینیی ساز كات
سه رمانی پێ پان كاته وه
به ڵكو .. ئه بێت
ئه وه ی قومێكی پێویسته
زۆر به ڕێزو سوپاسه وه

نـرخه كه يـمان بخاتـه مشت
جـائـه و كاتــه بيخواتـه وه !

ـ ١١ ـ

من نامه ويّت .. جارێكى تر
هێزى بازووى گه نجى شارم
له بێكارى و، له فيزارى
خاوبێته وه .. بپسێته وه
گورو تواناى ژيرانه ى
بوارى بۆ نه ڕه خسێت و..
له جياتى گه شه و پێشكه وتن
هه ر هه مووه كه ى
پووچ ببێته وه و
به ره و پاش بگه ڕێته وه..

ـ ١٢ ـ

ڕازى نابم ، جارێكى تـر
د يّوه زمه ى ( لا نُوافق )
ده ست له بينى شاكاره كان
بگيرێنى . .
چاويان لێ بز بكاته وه
له برى مۆڵه تى نيشان دان
په رده ى تۆزو تاريكيان
به ڕوومه ت دا بداته وه !!

ـ ١٣ ـ

قه ت ڕازى نيم .. جارێكى تر
بۆ هاتوچۆى ماڵه كه ى خـوا
ده يان مۆركم بۆ بتاشن
چه ند جار بمبه ن و بمهێنن
جا ئه و ساكه
ڕێگه ى هاتوچۆم بـو واز كه ن
هه ر كه ويستم
ده ست بده مه قورئانه كه
بڵێين بـقـه و..
ناپياوانــه
په ساپۆرته كه م له ت كه ن
ده ردى سه ربيه كم بۆ سازكه ن !!

ـ ١٤ ـ

من نامه ويّت .. جارێكى تر
ئه و ديمه نـــه
ته ڵخ و تارو ناسازانَه
ئاسمانى گه شى ئازادیى
كوردستانم
بشێوێنـــن .
قـايـل نابـم .. جارێكى تـر
ئه و داخ و زووخ و ژانانـــه
دڵى گه وره ى هيچ ڕه جاڵێكى
ئه م كورده
بـهه ژێنـــن .

- ١٥ -

جـا بۆ ئه وه ی
ویستـه كانـم ببنـه كردار
داواكارم .. كه تێكڕا بێن
نه كێ یه كێ و دوو.. به ڵكو هه موو
به كورِو كاڵ .. گه وره و منـاڵ ..
له پیرو لـه كۆنـه سـاڵ ..
له كیژو كه یبانووی ماڵ
عــه ود الاّ نــه ..
سه رمان بۆ خوا خه ینه زه وی
( سوجده) به رین بۆ ئه و خوایه ی
ده ستی سته می كرد نه وی . .
به س كام سوجده ؟!
چاوت پڕبێ له ئه سرین و
له بیمی خوا .. تا بله رزی
سوجده ی ئاواش
ده بێته مایه ی بــلـنـدی
تا زیاتر سه رت خه یته خاك؛
زیاتر پێی گه وره و سه ربه رزی
مێژووی پڕ شكۆی میلله تـمـان
شایـه ته بۆ ئه م ڕاستی یه
كه ته نـها (سوجده) یه چاره ..
كه ته نـها (سوجده) یـه چاره .
**********************
هه ڵه بجه ی شه هید ١٩٩٣/٣/٩ز

# وڵاتەکەم

وەڵاتـــەکەم !
مـنی شـاعـیر ..
لـەهەندەران کەر دارێک بم
لەڕیشەدا دەرم بێنن ،
بەتەشوو و تەور ، مشاری تیژ
لەت لەتم کەن .. دامبهێنن ،
بەئاگری "نەمروود"انی ڕۆژگارەکان
سەدەها جار بمسووتێنن ،
بڕوام وایە ، هیوام وایە
بڕوێمەوە و بـڕوێـمەوە ..
بەدڵخۆشی و بەشانازیی
بەرەو باوەشەگەرمەکەت
ئەبێت ڕۆژێک بێت بێمەوە .

*

*

*

وەڵاتەکەم !
گەرچی من ئێستا ملێکم
بێ پەرو باڵ ..
بێ ناز ، بێ ئاشنا عەودال
دەربەدەرو بێ هێلانەم ،
ڕوو لە هەر وەڵاتێ دەکەم
ناد یارو نامۆ و بێگانەم ،
گەر چاوو پێشم ببەستن
لە قەفەزی پۆڵاییندا بەندم بکەن ،
توندم بکەن ،
بڕوام وایە ، هیوام وایە ،
دەیشکێنم و دەردێمەوە ..
بەکامەرانی و تاسەوە
بەرەو نازی باوەشەکەت
ڕۆژێک دێت بگەڕێمەوە .

*

*

*

مامۆستا جمال حبیب اللّٰه
(بێدار)

وه لاتـــه كـــه م !
د و نـــد و تـــرۆپـــى ئـــاواتـــه كـــه م . .
ئه كه ر بمكه ن بـــه كه وهـــه رێ
بكه ومه چنگى بـــه شه رێ
لـــه و ڕه زيلـــتر نــه بووبێت و نه شبێتــه وه
له هيچ خاكێ و هيچ كيشوه رێ ،
يان بكه ومه ده ست شۆخترين كچى د نـــيا
هاوڕازى شه و و ڕۆژم بـــێت ،
بڕوام وايـــه
قـايل و بـه ختـه وه ر نـــابم ،
بـه جێێـى د يـلم ، ده رد يـمه وه
بـه ره و چـه م و ده شت و چيـات
هه ر ده بێ ڕۆژێكم هه بـــێ
بـه سه ر بلندى بيـمه وه .

*

*

*

وه لاتــه كــه م !
بێ هيوانيم ، ده زانى بۆ ؟
چونكه ئه من بێ بڕوا نيم
بێ ئاشنا و بێ برا نيــم
بێ غه مخۆر و بێ ده سبار نيم
سته مديده م ، سته مكار نيم
ماڵ ڕووخێن نيم ، ماڵ ڕووخاوم
ڕێگر نيم ، ڕێ لـێ گيراوم ..
ئارام ده كرم ، خواش له كه ڵ سابيرانه
مه شخه ڵ و چه كم ئيمانـه
بـــڕوا . . هـــيوا . .
بۆيـــه د يـــان ده يلـێـمه وه
ئه بێ منيش ڕۆژێكم بـــێ
بـــه ره و تــۆ بكه ڕێـمه وه

*

*

وه لأتـــه كـه م !
گه ر بێت هيواو ئاواتـه كه م
نه يه ته دی لـه ژيـانـما ،
بـه غه ريبی هه لۆی گيانكێش
بدات بـه سه ر مه لی گيانـما ،
وه ميه ت ده كـه م بۆ هاوه رده "بێبه ركه كان" ،
بۆ ئاواره خوێن كـه رمـه كان ،
چ تـه رمـه كه م ، چ ئێسقانم
به رنه وه بۆ نـاو خاكه كه ی
باپيرانم ..
به وه ش بڕوام هه ر دێته دی
حه زو هيوام هه ر دێته دی
وه هاش هه ر ده كه رێمه وه
بۆ لای تۆ دێم و دێمه وه .

مامۆستا جوتیار

بازی هەڵفریو دای لە شەقەی باڵ
لانەی بەجێ هێشت بۆ دنیای خەیاڵ

کە لێ تیژ فڕی بۆ ئاسمانی دوور
نەک لووتکەی چیا، هەوریش بەرەو ژوور

بە هیوای ئەوەی گڵ نەخواتەوە
بەرقی بوراقی پێ بشواتەوە

ئەو کێوە بەرزەی کە لانەی ئەو بوو
شەوانی عومری تیایا کڕ خەو بوو

وەک تەپۆڵکەیە دەیبینی بەحاڵ
شیوی نەرمی لا بوویە پێ چاڵ

خەڵکی دەبینی وەک مێروولەی ورد
خۆی نەبێ کەسی بەدی نەدەکرد

بێ ئاگا لەوەی چەند بەرزە فڕ بێ
مێشکی لە هەوای شابازی پڕ بێ

مەوداى هەڵفڕین تا سنوورێکە
ساتێکى کەم و، خوار و ژوورێکە
ڕێ نەگیراوە لە و سنوورەدا
ڕەسەنایەتى و خوار و ژوورەدا
ئافەرین کەسێ (طەیى حیجابات)
بەپێى (ارتقاء) ژیرانە دەکات
بارگەى کەماڵى بە مەوداى دوورى
لە نزیکا پڕ، لە دوورا نوورى
گەشتر و بەشتر، ڕەوێنى ڕەشتر
هەڵمەتى پڕ تین، تاوى سەرکەشتر
ئارامگەى دڵان پڕ بینایى کات
کرووزى گڕەى کار شینایى کات
نەوەک چوون نازک کشاوى گڕ بێت
بە خۆى و ئەغیار یا فڕ یاقڕ بێت
باڵى ئارامى بە لێزانانە
بخاتە وەکار ڕووە و ئاسانە
تا لە سەر پەڕەى دڵانى پەرۆش
سەرلە نوێ لانەى هیوا دەکا خۆش
دایکى میهرەبان باوەشى وازە
بۆ ئازیزى خۆى نەک بێچووى تازە
دیارى گەڕاوەى کەشکەشانى دوور
میهرەبانى بێت کە پڕیە لە نوور

xxx xxx xxx xxx xxx xxx xxx xxx xxx xxx

گوناهم ماچی ڕیزی ڕووخانەن
یانەو (حسنە) یم چڕە (دخان)ەن
سەبانەو عومریم بێخەلەو دانەن
تۆشەی ڕای قەبرم هاڵێن، بێنانەن
ڕام سەخت و دوورەن، ئینەیچ حاڵمەن
توخوا ناهەقمەن ناڵەناڵمەن؟!

ئەی نەفس! ئەهە تا کەی؟ ها کاروان لوا
ئانا شەوگاریچ پەلوپۆش کوا
هاکا چەوسەرۆ کاروان گێڵاوە
دەکێ گێڕی سەرەت کاسێ بولاوە[1]

مەزانو من تۆ چێشت کەردەن چەم
پاسە چوارمشقی نیشتەنی بێغەم
کێ بەتیکەو کێ لە مەش تێرە بۆ؟
گر کەس چەمو وێش پەی وێش مەکەرۆ

بــێـدار بەجـە وەرم ئەی نەفس ! وەسێـشـەن
خـەرمـانــی بــێ دان وەســێ کــەرەشـــــەن
تـــاکـەی مـــەنیشـی جـەگـۆشـەی غـەفــڵـەت؟
ور زەبـــیاوە ڕەفــیـقـات، نــەکـــبـەت!
ڕەفـیقـێت یــاوێ وەپـــۆپـــــەی ئـــاوات
تــۆیـچ بـنـەکـدار بــە پـەی هـاتونەهات
ئـــەی خـــوا ! وەفـریـای عـەبدت بـیـاوە
(أعدی عدوّ)[2] ی وســتـــــەن گـێـزاوە.

---

**پەراوێـــز :**

(١) کاسێ بولاو : کاسەیەکێ خۆڵەمێش و ئاو .
(٢) ئامارەیە بە فەرموودەی :(( أعدیٰ عدوّکَ نفسکَ التي بین جنبیکَ)) .

خوێنەرانی بەڕێز !

هەر لە وکاتەوە کە لە ژمارە (١١) دا بە ڵێنمان دا کە بچین بە پیر پرسیارەکانتانەوە ، چەند نامەیەکمان بۆ هاتن و هەندێ پرسیار ئاراستە کراون .. ئێمە پشت بە خوا لە یەکەمین هەلدا کە پرسیار دەگات بە رواری لێ دەدەین و ، پاشان بە گوێرەی دەرفەت و بە رەچاوکردنی سەرەی خۆشەویستان وەڵامدەدەینەوە . خوا ئەوەی ڕاست و دروستە بە گشت لایەکمان ئیلهام بکات و، لە تێکەوتن و هەڵە و تێنەگەیشتن ڕزگارمان بکات .

لێرەدا تکایەکێ لە هاوکاران دەکەین کە لە هەر نامەیەکدا دەینێرن پرسیارێکێ یا دوو پرسیار زیاتر نەکەن بۆ ئەوەی مافی کەسانی تر پێشێل نەکرێ و، ناشتوانرێ لە یەکێ ئەڵقەدا وەڵامی پرسیاری زۆر بدرێتەوە ..

ئێستە ش فەرموون چەند نامە و وەڵامێکێ :

○○ بەڕێز کاکێ ف . م عبداللّه کردووە . لە ڕاستیدا هەندێکێ سەنگاوی لە چەمچماڵ ،نامەیەکی لە پرسیارەکان پەڕاوێکێ یا ناردووە و، حەوت پرسیاری تێدا نامیلکەیەکی دەوێتا مافی

ته واو به وه لامه كه ی بدریٚ ، بوٚیـــه لیٚره دا ته نـها وه لامی دوو پرسـیـــاری ده ده ینه وه .

پرسیار / ئایا له ئیسلامدا ئـــه ده ب ده بیٚت له چ پیٚناویٚكدا به كـــــار بهیٚنریٚت و ، ئه ده بی ئیسلا مــــی ده بیٚت چوٚن بیٚت ؟

وه لام / كاكه گیان ! به كورتـــــی: ئه ده بی ئیسلامی ئه ده بی ژیـانــه ، مه وداكه ی راستكردنــــــــــه وه ی بوٚچوونه كان و ریٚكخستنـــی بـــاری ره وشتی مروٚڤه ، بوٚ ئه وه ی بـــــه باشترین شیٚوه ئه ركی به ندایــه تــی به ریٚته سه رو سه ره نجـــام زه وی ئـــاوه دان بكاته وه و خه لـكی خوا بحه ویٚنیٚته وه .

به م پیٚـیه ، هه ر كات ئـــه ده ب له خزمه ت خه لكی خوا دا بـــوو و، پیٚودانی شه رعی خوای تیادا ره چــاو كرا ئه ده بی ئیسلا می یه ، وه هـــه ر كات یه كیٚك له به رژه وه ندی یه كانی مروٚڤی تیٚـد ا پیٚشیٚل كرا ئـــــه وه ئیسلا مه تـی له ده ست ده دات .

به رژه وه ندی یه كانی مروٚڤـیـش كه بریاره له ئایینی خوادا پاریٚزراوبن ، له پیٚنج لا یه ندا كوٚكراونه ته وه :

(١) پاراستنی ئایین .
(٢) پاراستنی ژیری ( عقـل ) .
(٣) پاراستنی گیان .
(٤) پاراستنی ره چه لهك ( نَسل ) .
(٥) پاراستنی دارایی .

جا ئه گه ر ئه ده ب له خزمه تی یه كیٚك له م پیٚنج به رژه وه ندیه دا بوو ئه وه ئیسلامی یه ، به زیانـــــی یه كیٚك له مانه بوو ئه وه ئیسلا مــی نی یه ، با خاوه نیشی موسلمان بیٚت، وه دارشتن و رازاندنه وه ی ده ره وه ی بابه ته ئه ده بی یــه كه ش بـــــــه ره نـگی ئیسلا مـــی بیٚت .

بوٚ زیاتر روون بوونه وه داوا له برا ی به ریٚزو خویٚنه رانیش ده كه ین كـــه سه یری لیٚكوٚلینه وه ی (ره سه نایه تی و هاوچه رخیٚتی ) بكه ن له ژماره(١)و (٢) ی گوٚڤاری ( په یامی راستی ) كه هه ندیٚ لا یه نی ئه م كیٚشه یه ی تیٚد ا شی كـراوه تـــه وه .

پرسیار / هەندێکەس دەڵێن : پێویست ناکات ئێمە لە زانستەکانی (فقه ، حدیث ، علوم الحدیث.. هتد) زۆر شارەزا بین ، بەلام پێویستە بە (فیقهی دەعوە) و ئیسلام بلاوکردنەوەوە خەریک بین ..
ئایا ئەمە راستە ؟

وەلام / لە راستیدا بانگکەری رێی خوا دەبێ لە هەموو زانستەکاندا ئاگاداریی هەبێت تا بەهەلەدا نەچێت ، چونکە ئەو زانستانە هۆن بۆ کەیاندنی بانگەواز و بانگخوازیش بەبێ ئەوانە تفاقی پێ نابێ و دوچاری نەزانین و هەلە کردن دەبێت . بێگومان لە گرنگیی زانستە-کاندا پێشخستن و پاشخستن هەیە، بۆنموونە : ئاگاداریی لە قورئان لەسەروو هەموو پێویستییەکانەوەیەو پاشان فەرموودە و ژیاننامەی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێ) دێت بەدوایدا ، وە هەروەها .
ئەوەندە هەیە کە پێویست ناکات هەموو (داعی) یەک پسپۆر بێت ..

بەلام دەبێ رۆشنبیریی گشتیی ئیسلامی هەبێت . لە پال ئەوانەشدا دەبێت لە هەر بوارێکدا پسپۆڕی تایبەت هەبێت .
باشترین دروشمێک لە م بوارەدا کە ئیسلامییەکان دەبێ لەبەری بکەن (دەبێ لە هەموو شتێک شتێک بزانین ، وە لە شتێک هەموو شت بزانین) . مەبەست لە برگەی یەکەم رۆشنبیریی گشتییە ..
مەبەست لە برگەی دووەم پسپۆڕییە.

وەلامی تایبەت :

---

بەرێز کاک عەطا ئەحمەد !
پرسیارەکەت ئاراستەی جێی خۆی کرا ، چاوەروانی وەلام بە .
بەرێز کاک جمیل قادرعبداللە
لەهەلەبجە !
سەردانەکەی پاپا بۆ (سودان)، بۆ دوپاتکردنەوەی هەلوێستی پشتگیریی خۆی و هاوپەیمانانی بوو لەهەلگەراوەکانی خوارووی ئەو ولاتە .. چونکە لە وتەکانی

خۆیدا ئه مه ی به ڕوونی ڕاگه یاند .

* به ڵێ ئیسلامی یه کان له ئه نجومه نی میصردا ئه ندامیان هه یه .

* ( فَتحي يَكَن ) سه رۆکی " کۆمه ڵی ئیسلامی" ( الجماعة الاسلاميّة )ی لوبنانه و، ئه ندامی ( حَماس ) نی یه .

* بۆ پرسیاری سێیه مت ، وشه ی ( أصولي ) له ژماره داهاتووه کاندا چاوه ڕوانی ڕوونکردنه وه یه کێ به .

ئیتر تا ژماره یه کی ترو، چه ند وه ڵامێکی تر به خوای گه وره تان ده سپێرین .

%%%%%%%%%%%%%%%%%%%

له ( یوسف ) پێغه مبه ریان پرسی : تۆ که خه زێنه ی ده وڵه ت هه موو له ژێر ده ستدایه ، بۆچی خۆت برسی ده که یت ؟

ئه ویش فه رمووی : " ئاخر ئه گه ر وا نه که م هه ژارو برسی یه کانم له بیر ده چێته وه .." .

ooooooooooooooooooo

خوێنەرانی بەڕێز !

لە یادی ڕاپەڕینە مێژووییەکەدا ، وێڕای سڵاو و ڕێزی دووبارە و ، هیوای پاراستنی دەستکەوتە سوودمەندەکانی ، سەردەدەینەوە لە کۆگای ڕەنگینی نامەکانتان و ، لەگەڵ دەستەیەکی تر وەڵامدا بەیەکێ دەگەینەوە هیواداریین هەرچی زیاتر دەستە ئەدەبی و ڕۆشنبیری یەکانمان سەرگەرم کەن ئێمە هەر مەمنوونین و وێڕای ماندووبوون لە خزمەتداین .

بەڕێزان : کاکێ صدیق لە قەلادزێ ، کاکێ عەطا ئەحمەد ، کاکێ عثمان حسین گەلاڵی ، باوکی ڕاستی ، کاکێ عمر عەلی حمە رشید ، خوشکە شنۆ احمد ، کاکێ کمال علی ، کاکێ جمیل قادر لە هەڵەبجە ، کاکێ ابوبکر محمد امین لە عەربەت ، کاکێ ئاری عبدالرحمن لە ڕانیە !

بابەتەکانتان گەیشتن ، دەست و پەنجەتان خۆش بێ .. بە پێی بڕیارێ کە پێشتر دامان و، داوامان لە هاوکاران کرد کە تێبینیی یاساکانی نامەنووسین بکەن ، نەمانتوانی سەیری بابەتەکانتان بکەین .. هیواداریین جارێکی تر بەڕەچاوکردنی

**ئه وخالأنه وه كه چه ند جـــار ئاراسته مان كردوون نـــووسراو بنێرن به تايبه تی تێبينیيه كانـــی لاپه ره (٨٣) ی ژماره (١١) ی ئـه م گۆڤاره .. هيواداريين دڵگران نهبن.**

به ڕێزان : خوشكه چيمــه ن محمد غريب ، خوشكه تابـــان حسين محمد ، خوشكه بێگــه رد احمد ! بابه ته ره مه زانييه‌كانتان كاتێك گه يشتن كه ژماره (١٢) ی گۆڤاره كه له ژێر چاپ دا بــوو داوای لێبووردنتان لیٚ‌ده كه یـن، ده بوايه زووتر بتاننارداية .

**به ڕێزان : مامۆستاحمه كـريم عبد الله ، كاك عبد الله احمـد ، كاك ئاری له ڕانيه ، خوشكه سروه فريق احمد ، خوشكه زه هره عبـد ـ العزيز، كاك هێمن قادر، بـاوكـی دانـا، كاك فاتح عبد الرحمن لـه كۆمه ڵگای سـه ركـه وتن، كـاك جلال الدين نجم الدين له هه ڵه بجه ، بـاوكی بشریٚ له سه ركاريٚــزی سلێمانـی، كاك رزگار حسين، خوشكه بێگه رد لــه سه رچنار، كاك طـالـب حـمه سعيد !**

نامه و بابه ته كانتان گه يشتن، پشت به خوا به گوێره ی هــه ل و ده رفه تی ره خساو به ره و پێش چاوی خوێنه ران ده خرێنه ڕیٚ . سوپـاسی هاوكاری و دڵسۆزيتان ده كه يـن .

**به ڕێزان : كاك ده ربار لــه باريـكه ، خوليا و لوقمان‌گه لالـــی له سلێمانی، علی عبد الرحمن قـادر له چه مچه ماڵ، كاك سۆران سێوكانی بـرايان ! شيعره كانتان‌گه يشتــن ، ده ست و په نجه تان‌نه رزیٚ، خــوا سه ركه وتووتان بكات و، چاوه ڕێــی به رهه مي به پێز ترتـانـين .**

برايان : كاك طارق نجيب رشيـد له برايه تی، باوكی ناودارلـــه ئۆردوگای كامياران، محمد حسيــن چــيـا ، كاك عــه لی ئه حمــه د ! شيعره كانتان گه يشتن.. هيــوای به رده وامی و سه ركه وتنتان بـــۆ ده خوازين ، له داهاتوودا به گوێـره‌ی توانا سووديان لیٚ‌وه رده گيرێت .

**برای به ڕێز كاك بوخاری جميـل شاوه يس له هه ولێر! شيعره كانـت گه يشتن ، له گه ڵ به پێزيی ناوه رۆكدا هه وڵ بده خيطابه شيعری يـــه كه**

لە گەڵ ڕێزەوی گۆڤارەدابگونجێ .
کاکێ فاتح عبد اللە رحمـــــن
( بە ختە وە ر ) ! سوپاسی هە ستــی
بە رزی برایانە ت دە کە یـــــن و،
برای سە روە رمـانــی . بــــــــۆ
شیعرە کە شت حە ز دە کە ین زیاتـر
هە وڵ بدە یت و بە رهە مـــــــــی
باشترمان بۆ بنێری . چاوە ڕوانین .
برای بە ڕێزمان باوکی هێمـــن
لە سلێمانی ! خوا پاداشتی ئـــەو
سۆزە بە کوڵە ت بداتە وە کـــــە
دە ربارە ی ( ماموستا ابراهیـــم
فتاح ) دە رت بڕیـــوە ، لە بـــــەر
درێژیی نە مانتوانی بـــــــلاوی
بکە ینە وە . لە شوێنی خـۆیـــــدا
سوودی لـێ وە ردە گیرێــت .
بە ڕێز کاکێ صادق هە ڵە دنــــی
کۆپلە شیعرێکی بۆ ناردووین تیایدا
دە ڵـــێ :
ولاتـە کـــە م !
وە کێ چۆن بە فر
عە شقی لـووتکە و چیاکانــە . .
چۆن پە روانــە ش
شە یدای تیشکی ڕووناکی یە و
هە ردە م بـۆی قـوچی قوربانــە . .

ئە وا منیش برِیار ئـە دە م
ببمە دە وای زامە کانت و
بـۆ مافی گشت هە ژارە کان
ببمە شوێنکە وتووی کاروانــی
ڕێبـازە کە ی ئە م قورئانە .
زۆر سوپاسـی دە کـە یــــــن و
هیواداریین بە رهە می ترمان بۆ بنێری.
چــە ند وە ڵامێکی تایبــە ت :
بە ڕێز ماموستا نامق لە بە ڵخە ی
هە وراما ن ! سوپاسـی ئە و هە ستــــە
برایانە یە ت دە کە ین کە لە نـامــە
خنجیلا نە کە تدا دە رت بڕیوە .
داواکاری یە کە تمان بۆ نابرێتە سە ر،
چونکە گۆڤارە کە مان ـ بە هـــــــۆی
کە م کارە بایی و کە م تفاقی یـــــە وە ـ
لە کاتی خـۆیـدا دە رناچێت . سوپاسی
هاوکاریت دە کە ین .
بە ڕێز کاکێ ( ا . ع ) ! نامە کــە ت
گە یشت ، بە ڕاستی دوو سێ جـــــار
ئە مد یو و ئە و د یومان کرد هیچــی
لێ حاڵی نە بووین . . تکایە بـــــە
ڕێنووس و خاڵبە ند یی دروستـــە وە
نـامـە بنـێرە . سوپاست دە کە ین .
تازمارەیەکی تر هەر سەرکەوتووبن

مزگه وتی گه وره ی (( خـورمـــال )) پاش ئاوه دانکردنه وه ی له لایه ن
(ده زگای فریاکه وتنی ئیسلامیی جیهانی ) یه وه.

# ڕۆژژمێری مانگ

٣/١ کۆچی دوایی ڕابەری شۆڕشی نوێی کورد (مەلا مصطفی بارزانی) (١٩٧٩) .
ڕۆژی ماموستا .

٣/٣ شۆڕشی دەرسیم (١٩٣٧) .

٣/٤ کۆچی دوایی پێشەوای گەورە (صلاح الدین) ی ئەییوبی (١١٩٢) .
بۆمبارانی شاری سلێمانی لە لایەن ئینگلیزەوە (١٩٢٣) .

٣/٥ دەست پێکردنی ڕاپەرینی گەلی کوردستان لە **ڕانیە**وە (١٩٩١) .

٣/٦ ڕێککەوتننامە شوومەکەی نێوان عێراق و ئێران لە جەزائیر (١٩٧٥) .

٣/١١ ڕێککەوتننامەی نێوان شۆڕشی کوردی عێراق و دەوڵەت (١٩٧٠) .

٣/١٢ کۆچی دوایی شاعیر عبدالجبار ئاغا (کانی) (١٩٥٧) .

٣/١٥ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (هاوار) لە (شام) (١٩٣٢) .

٣/١٦ مەرگەساتی **هەڵەبجە** . بۆمبارانی کیمیایی شاری هەڵەبجەو، شەهید بوونی زیاد لە (٥٠٠٠) بێتاوان و بریندارو ئاوارە بوونی هەزاران و کاول بوونی زوربەی شار (١٩٨٨) .

٣/١٩ کۆچی دوایی زانای پایەبەرز (**إبن خلدون**) (١٤٠٦) .

٣/٢٠ کۆچی دوایی (**نیوتن**) ی زانا (١٧٢٧) .

٣/٢١ سەری ساڵ (٢٦٩٣) .

٣/٢٢ دامەزرانی (الجامعة العربیّة) (١٩٤٥) .

٣/٢٣ کۆچی دوایی زانای پایەبەرزی کوردستانی [illegible] نووری) (١٩٦٠) .

٣/٢٤ بۆمبارانی کیمیایی ناوچەی **قەرەداغ - دیوانە** (١٩٨٨).

٣/٢٦ بڵاوبوونەوەی گۆڤاری (نزار) لە بەغدا (١٩٤٨) .

٣/٣١ لەسێدارەدانی پێشەوا (**قازی محمد**) و هاوڕێکانی (١٩٤٧) .

